# چوار ئیمامەکەی ئیسلام

ن/ عماره محمد عماره

پیشەوا ئەبو حەنیفە

پیشەوا شافیعی

پیشەوا مالیک

پێشەوا احمد بن حەنبەل

و/ فاورق بال...





# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوک : چوار پێشەوا

بابەت : ئایینی

ئامادەکردنی: عمارە محمد عمارە

وەرگێرانی : فاروق بالیسانی

کۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا

چاپ : چاپی یەکەم/ ٢٠١٠

شوێنی بلاوکردنەوە: ( کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی)

لە بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە سپاردنی ( ١٢٤٦ ) سالی ٢٠١٠ پێدراوە

بلاوکراوەی کتێبخانەی

حاجی قادری کویی

بو فروشتن و چاپکردن و بلاوکردنەوە

هەولیر کوردستان عیراق

(٠٧٥٠ ٤٦٧ ١٣ ٩٤ - ٠٧٥٠ ١١٨ ١٩ ١٩ ☎ - ٠٦٦ ٢٢ ٢٣ ٨٦٨)

# چوار پێشەوا

## پێشەوا ئەبوحەنیفە
## پێشەوا شافیعی
## پێشەوا مالک
## پێشەوا احمد بن حەنبەل

ئامادەکردنی

**عمارە محمد عمارە**

وەرگێڕانی

**فاروق بالیسانی**

٢٠١٠

# پێشەکی

سوپاس‌و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانەکان، بەهۆی پێشەوایانی ڕێنمونی کارەوە نیعمەتی ڕژاندووە بەسەر ئوممەتی موسڵمانەوە، گەواهی ئەدەم هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە (الله)، تاك‌و تەنهاو بێهاوبەشە، گەواهی دانی بەندەیەك بێت بەڕێزو کەرەم‌و منەتی گەورەیی خوای گەورە لەسەر خەڵکی.

گەواهی ئەدەم کە محمد بەندەو نێردراوو لە باشترین دروست کراوەکانیدا هەڵی بژاردووە، ئەو نێردراوەی کە زوهدو وەرع‌و خۆپارێزی (تقوی) چاند لەنێو دڵی هاوەڵەکانیدا، ئینجا ئەوانیش ئاڵای زانستیان بۆ مرۆڤایەتی بەرزکردەوە، ڕازیش بوون لە ڕێبازو ئایینی خوای گەورە.

ئەی خوایە درودو میهرەبانی بڕژێنە بەسەر پێغەمبەر (ﷺ)و ئالی بەیتی چاك‌و پاك، ئەی خوایە ڕازی ببە لە هاوەڵانی‌و جێنشینەکانی‌و ئەو کەسانەش کە لەسەر بەرنامەو پەیڕەوی ئەوانن تاوەکو ڕۆژی هەستانەوە...

ئەم پەرتووکە باس لە هەر چوار پێشەوا ئەکات، ئەو پێشەوایانەی کە زۆر زاناو شارەزابوون لە ئایین، خاوەنی چوار مەزهەبەکەی شەریعەت، ئەو مەزهەبانەی کە لە ڕابردووو ئێستادا ناوبانگیان هەیە، پێشەوایەکانیش

بریتین لە:- پێشەوای گەورە (الامام الاعظم) ئەبو حەنیفەی نعمان، و پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەسی پێشەوای شاری کۆچی پێغەمبەر (مدینه) (ﷺ)، پێشەوا محمدی کوڕی ئیدریسی شافیعی، گەنجی قورەیشی کە ڕەچەڵەك و بنەچەی ئەگەڕێتەوە سەر هەمان بنەچەی پێغەمبەر (ﷺ)، پێشەوا احمدی کوڕی حنبل پێشەوای ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕەزای خوا لە هەموویان بێت.

ئەم پەرتووکەم نوسیووە تاوەکو ئەو پلەو پایەی ئەم پێشەوایانە کە لەنێو خەڵکیدا بە دەستیان هێناوە بۆ ڕۆڵەکانی موسڵمانان روون بکەمەوە، (بەدەست هێنانیشیان) لە دەرەنجامی ئەو کۆششە گەورەیان بوو لە پێناو خزمەت کردنی شەریعەت و فیقهی ئیسلامی و ئەنجام و بەرهەمی ئەم کۆششەیان میرات و مانەوەی زانایی و شارەزاییەکی گەورە بوو لە ئاییندا کە شیاوی شانازی کردنە بۆ ئیسلام و موسڵمانان ئەو کاتەی خوای گەورە ئەم زەوییە و دانیشتوانی.

سەرچاوەی شارەزا بوون لە ئاییندا بریتییە لە قورئانی پیرۆز، راستەوخۆ لەلایەن خوا ڕەوانە کراوە بۆ سەر زەوی، سەرچاوەی دووەمیش سوننەتی پاکی پێغەمبەرە (ﷺ) روونکەرەوە و راڤەکارە بۆ ئەحکامەکانی قورئان.

سەرەڕای ئەوەی ئەم پێشەوایانە خزمەتێکی گەورەیان بە ئیسلام و موسڵمانان کردووە، بەڵام ئەوە هەیە هەندێك ناخۆشی و چەرمەسەریان تووش بووە، ئەو بەڵایانەی بوونە هۆی روونکردنەوەی پاکی و ڕەسەنایەتی

ئەوان‌و بێگەردی بیرو باوەڕو ئازایی‌و بەرگەگرتنیان بەرامبەر ئەزیەت‌و ئازار لە پێناو خوای گەورەدا.

هەریەك لەم پێشەوایانە تاقیکردنەوەو بەڵایەکیان بەسەردا هاتووە، جیاواز بوو لە ئەوانی تر، ئینجا خۆراگر بوون بەرامبەر بەم بەڵایانە، ئارامیان گرت‌و بە ئەندازەی گەردیلەیەك بیرو باوەڕیان نەگۆڕا، هەتاوەکو خوای گەورە پلەوپایەی بەرزکردنەوە، بوونە زانایانی شارەزای دڵسۆز لە تێکۆشان‌و دڵسۆزی‌و خۆپارێزیان.

مەبەستی یەکەم لەم کتێبەدا سەرنج راکێشانی رۆڵەکانە بۆ لایەنەکانی ژیانیان، تاوەکو خوێندنەوەیەکی وردی ژیانی ئەم زانایە دڵسۆزانە بکەن، و رێچکەی ئەوان بگرن بۆ ئەو خزمەتەی پێشکەشی ئیسلام‌و موسڵمانانیان کردووە.

لە خوام داوایە ئەم کارە بگێڕێت تەنها لە پێناو ئەو (خوای گەورە)دا بێت‌و سوودبەخش بێت بۆ موسڵمانان لە هەر کات‌و شوێنێکدا.

لە تای تەرازووی چاکەی من‌و دایك‌و بابم لەو رۆژەی ماڵ‌و منداڵ سوودێکی نییەدابنێت، تەنها ئەو کەسەی بە دڵێکی پاکەوە بێت، هەر خواش مەبەست‌و ئاواتەو ئەویش رێنمونیکاری سەر رێگەی راستە.

لەکۆتاییدا سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

**عمارە محمد عمارە**

(المنصورة – مصر)

## ١- ناو، بنەماڵە، شوێنی لە دایك بوونی؛

ناوی تەواوی نعمان کوڕی ثابت کوڕی مرزبان کوڕی زوطـي (التيمـي) کوفەیی گەورەو رێزداری نەوەی (تیم الله)ی کوڕی ثعلبـەیـە، دەڵـێن لـە نەوەی فارســە ئازادەکانــە، ســەر بــەخێزانێکی بــەڕێزن لــەنێو گەلەکـەی خۆیاندا، لە بنچینەشدا خـەڵکی (کـابول)ن- پایتــەختی ئێـستای وڵاتـی ئەفغانستان- مرزبانی باپیری لە سەردەمی جێنـشینایەتی عمـر – ڕەزای خوای لێ بێـت – موسـڵمان بـووە، پاشـان چـۆتە شـاری کوفـەو لـەوێ نیشتەجێ بووە.

پێشەوای گەورە ئەبوحەنیفە ی نعمان کوڕی ثابت لـە سـاڵی هەشـتای کۆچی پێغەمبەر (ﷺ) لە دایك بووە. لە دایـك بوونەکەشـی لـە شـاری کوفەو لە سەردەمی خەلیفە عبدالملك کـوڕی مـروان بـوو، لـەو کاتەشـدا کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ)لە ژیاندا بوون.

ئەگێڕنەوە پێشەوا ئەبو حەنیفە، ئەنەسی کوڕی مالیك خزمــەتگوزاری پێغەمبەر (ﷺ)ی بینیوە.

وتراوە ناوی (نعمان) بە مانای (خوێن یاخود ڕۆح) دێت، بـە گـوێرەی ئەم واتایەش ڕێککـەوتن‌و گونجاویـەکی جـوان‌و باشـی هەیـە لـە نێـوان پێـشەواو ناوەکەیـدا، چـونکە ئەبوحەنیفـە کۆڵەگـەو ڕۆحـی شـەریعەتە (الفقه)و بۆ شەریعەتیش بووە یاساو بناغە.

**نازناوی:-**

ابوحنیفة (مؤنث حنیف) واتە خواپەرست یان موسڵمان، چونکە (حنیف) بە واتای کەسێك دێت کە لەسەر ئایینی راستو دروست بێت.

وتراوە هۆکاری ئەم نازناوەی، بەردەوام (شوشەی مەرەکەب) لەلای بووە، بەشێوەزاری خەڵکی عێراق بە (شوشەی مەرەکەب) دەڵێن (حنیفة).

**٢- رەوشتی:-**

پێشەوا ئەبوحەنیفە رەنگو روویەکی زۆر جوانی هەبوو، رەوان بێژو دەنگێکی خۆشی هەبوو. رووێکی گەشاوەو ریشێکی جوان و پۆشاکێکی جوانی ئەپۆشی، هەروەها مەجلیسو لەگەڵ دانیشتنی زۆر خۆش بوو، کەس بێتاقەت نەدەبوو، هەرکەسێك لە کۆڕەکانی بووایە درێژەی بە دانیشتنی خۆی ئەدا لەنێو کۆڕەکەدا، لەبەر روونیو پاراویو وتە جوانەکانی، زۆر بەرێزو دڵفراوانو میوان دۆستو چاکەکارو بە یەکسانی سەیری ئەکردن، خۆشەویست بوو لەلای خەڵكو بەناوبانگ بوو، لە نێوانیان بە زانستێکی زۆرو بە ئاینو رەوشتی جوانو رێكوپێك، زۆر حەزی لە بۆنی خۆشو گوڵاو ئەکردو بەردەوام بە کاری ئەهێنا، تاوەکو ئەڵێن:- بەهۆی ئەو بۆنە خۆشەی لە پۆشاکی ئەدا خەڵك ئەیانزانی هاتۆتە دەرەوە پێش ئەوەی چاویان پێبکەوێت.

لە بنەماڵەدا:- لەناو عەرەبان لە دایك بووەو هەر لە ناویشیاندا پێگەیشتووە، باپیرەکانی فارس بوون، بەڵام ئایینی ئیسلام هیچ جیاوازی

دانانێت لە نێوان عەرەبێك‌و نەعجەمیەك تەنها بـە خۆپـارێزی (تقـوی)و کردەوەی چاك نەبێت.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات: ١٣). واتە: بەڕێزترینتان لای خوا ئـەو کەسـانەنە کە زۆرتر لە خوا ترسەو فەرمانبەرداری خوایە)

پێغەمبەریش (ﷺ) لـە حـەجی ماڵئـاوایی فەرموویـەتی:- ((ئـەی خەڵکینە ئاگاداربن پەروەردگارتان (یەك)ە، لەیەك دایك‌و باوکن.ئاگاداربن گـەورەیی‌و رێـزی عـەرەبێك بەسـەر نەعجـەمێك، نەعجـەمێك بەسـەر عـەرەبێك، یـان سـوور پێـستێك بەسـەر رەش پێـستێکدا، یـاخود رەش پێـستێك بەسـەر سـوور پێـستێکدا نییـە، تـەنها بـە خۆپـارێزی‌و فەرمانبەرداری خوای گەورەوە نەبێت)).

ئەگەر پێشەوا ئەبوحەنیفە بنەچەی عەرەب بێت یان نا، چ جیاوازییەك ناکـات، چـونکە بەسـیەتی ئـەو پێـشەواو شـارەزاییەکی ئـایین‌و زانـاو فەرموودەزان، و (جگە لەمانەش) لەو رەوشتە بەرزانەی هەیەتی.

## ٣- پێگەیشتنی زانستیانەی:-

پێشەوا ئەبوحەنیفە لە کوفەو لەناو خێزانێك پێگەیشت بەناوبانگ بـە خواناسی‌و چاکەکارو پارێزکارو زوهدو وەرع، خێزانێکی باش بوون، باوکی دوکانێکی هەبوو جلو بەرگی تیا نەفرۆشت، ئەبوحەنیفە لەو کەسانە بـوو هەر لە منداڵییەوە قورئانی لەبەرکردو زیرەك‌و چاپوك‌و دیاربوو.

ئەبوحەنیفە بەشێوەیەك‌و بە پلەیەكی بەرزو بەرچاو لە زانستدا پێگەیشت بووە هۆی پلەوپایەیەكی بەرزو گەورەی لەناو زاناو شەرع زانەكاندا هەبێت، لە سەردەمێكدا بوو زانای پایە بەرزو هەڵكەوتووی زۆری تیا هەڵكەوتبوو لە لایەك، لەلایەكی تر ئەو خەڵكانەی ئەیانویست یاری بە بیرو باوەڕی ئیسلام بكەن‌و بەرەو ئاقارو ڕێگایەكی هەڵدێری ببەن كەم نەبوون.

پێشەوا ئەبوحەنیفە لەو سەردەمەدا پێگەیشت‌و ناوبانگ‌و پلەوپایەو ڕێزێكی زۆری لەنێو خەڵكدا دەستەبەر كرد هەتا ئەگا بەم سەردەمە ئێمەشی لەگەڵ بێ هەر بەردەوامە.

## ٤- داواكردنی زانست‌و خوێندنی:-

پێشەوا ئەبوحەنیفە وەكو پێشەوا مالیك‌و شافعی‌و احمد لە منالییەوە دەستی بە خوێندن نەكرد، بەڵكو هەر لە تەمەنی بچووكییەوە خەریكی كاری بازرگانی‌و كڕین‌و فرۆشتن بوو، تاوەكو زانایەك كاریگەری لەسەر هەبوو كە بووە هۆی ئەوەی لە كاری بازرگانییەوە بیگۆڕێت‌و بەرەو خوێندن‌و دەستەبەركردنی زانستە شەرعیەكان هەنگاو بنێت، زانایەكەش (ئەلشەعبی) فەرموودەناس‌و شەرع زان بوو، جارێكیان سەرنجێكی وردی ئەبوحەنیفەی داو بینی خاوەن ووشیاری‌و زیرەكی‌و بلیمەتیەكی بێ وێنەیە، بۆیە هانی داو زانست‌و زانیاری لەلا خۆشەویست كردو ئامۆژگاری كرد بخوێنێت.

پێشەوا لەم بارەیەوە بۆمان ئەدوێت و ئەڵێ:- ((رۆژێکیان بەلای (ئەلشەعبی)دا تێپەڕیم و ئەو دانیشتبوو، بانگی کردم ووتی:- بەردەوام سەردانی کێ ئەکەیت؟ ووتم:- بەزۆری ئەچمە بازاڕ، وتی:- مەبەستم چوونە بازاڕ نییە، بەڵکو مەبەستم سەردان و هاتوچۆی زانایانە، منیش پێم ووت- کەم کەم سەردانی زانایان ئەکەم، ئینجا پێی وتم:- بێ ئاگا مەبە، پێویستە هاتوچۆی زانایان بکەیت و زانست و زانیاری بخوێنیت، چونکە زیرەکی و وشیارییەکی زۆر لە تۆدا بەدی دەکەم)). ئەبوحەنیفە ووتی:- ((قسەکەی کەوتە دڵم، وازم لە چوونە بازاڕ هێناو چوومە خزمەت زانایان بۆ خوێندنی زانستەکان، خوای گەورە سوودو کەڵکی پێبەخشیم لە بەرامبەر ئەمەدا)).

ئەبوحەنیفە بەردەوام بوو لە هاتوچۆکردنی زانایان و کۆڕی زانست و زانیاری، لەهەر یەکێکیان هەندێکی لێ وەرئەگرت و تاوەکو لە زۆر زانستدا شارەزابوو، بەمەش بنکەیەکی فکری لە زانستە گشتییەکان بۆ خۆی دامەزراند، تا ئەو کاتەی ویستی ببێتە پسپۆڕ لێی، بەڵام ئایا کامە زانستە کە پێشەوای سەردەم ئەیەوێت لە زانستەدا ببێتە پسپۆڕ و بە تەواوی شارەزایی لێی هەبێت.

ئا ئەمەیە برایان ئەمەوێت لە بەندی داهاتوودا پێتان رابگەیەنم.

## ٥- پسپۆڕی و تایبەتمەندبوونی لە بواری شەرعدا:-

پێشەوا بەردەوام پرسیاری لە خۆی ئەکرد، ئاخۆ لە چ بوارێک لە بوارەکانی زانستدا خۆی قاڵ بکات و ببێتە پسپۆڕ لێی، تاوەکو بۆ

خوێندنی وردو رۆچوون لێی هەڵی ببژێرێت، ئەمە وەکو کەسێك وابوو کـە سفرەیەك لە جۆرەها میوەی لە شێوەی سێوو هەنارو هی دیکەی لە پـێش دابنرێت تاوەکو هەڵی بژێرێت، ئینجا پێشەوا ئەبوحەنیفە بواری (الفقه) (شەرع)ی هەڵبژارد.

پێشەوا ئەبوحەنیفە بۆ قوتابییەکانی باس ئەکاتو ئەڵێت:- لـە دوای ئەوەی ویستم بخوێنمو لە زانست شارەزابمو باسم لە هەڵبژاردنی زانستەکان ئەکردو پرسیاری پاشەڕۆژی زانستەکانیشم ئـەکرد، ئینجـا وتم:- قورئـان فێرببە، منیش وتم:- ئەگەر هـاتوو قورئـان فێربـوومو لەبـەرم کـرد ئایـا سەرەنجامەکەی چۆنە؟ ووتیان:- لە مزگەوت دائەنیـشیتو منـداڵو تـازە پێگەیشتووان لەلات ئەخوێنن تاوەکو کەسێك پەیدائەبێتو لـە تـۆ زیـاتر قورئانی لەبەربێت یاخود یەکسان بێت لە دەرخ کردن لەگەڵ تـۆدا، ئینجـا رەغبەتی خەڵکی لەسەر تۆ کەم ئەبێتەوە.

وتم:- ئەگەر خۆم فێری فەرموودە بکەمو بیانووسمەوەو دەرخیان بکـەم بەشێوەیەك بێت کە کەس لـە دنیـادا فـەرموودەی زیـاتر لەبـەر نـەبێت؟ ووتیان:- ئەگـەر بەسـاڵا چـوویی‌و لاواز بـووی فـەرموودەت خوێنـدەوەو منداڵو تازە پێگەیشتووش لە دەورت بوون، لەبەر ئەم پیربوونەو لاوازیەت دڵنیانیت ئاخۆ هەڵە ئەکەیت یاخود نا، خۆ ئەگەر هەڵە بکەیت بـە درۆزن ناوت ئەبەن، و ئەمەش بۆ پاشـەڕۆژت بـە عـەیبو ناتـەواوی ئـەژمێرن، منیش، ووتم:- پێویستم بەمە نییە.

پاشان سەبارەت بە فێربوونی رێزمانی عەرەبی، ووتم:- ئایا ئەگەر خۆم شارەزای زمانو رێزمانی عەرەبی بکەمو یاساو رێـساکانی لەبـەر بکـەم

سەرەنجامم چۆت ئەبێت؟ ووتیان:- ئەبیتە مامۆستا، مووچەکەت (دوو) دینار تا (سێ) دینارە، ئەمەش هیچ پاشەڕۆژێکی نییە، ئینجا ووتم:- ئەگەر شارەزابم لە شیعرو کەس لەمن شاعیرتر نەبێت، ئایا سەرەنجامم چی ئەبێت؟ ووتیان:- مەدحی ئەمو ئەو ئەکەیت، دیارییەکت پێ ئەبەخشێت، یان سواری وولاخێکت ئەکات یاخود پۆشاکێکت ئەداتێ، وە ئەگەر هیچت نەداتێ بە شیعر زەمی ئەکەیت، ئەوا بێ هۆ تانەو لۆمەی خەڵکی ئەکەیت. ئینجا منیش ووتم:- پێویستم بەمە نییە. دوایی ووتم:- ئەگەر خۆم شارەزای زانستی (کلام) بکەم ئایا سەرەنجامی چۆنە؟ ووتیان:- هەر کەسێك ڕۆبچێت لە زانستی (کلام)دا ئەوا سەلامەت نابێت لە قسەی نادروستو نارێك بۆیە لەو کەسانەی ئەژمێرن کە لە ڕێ دەرچووەو بێ باوەڕ بووە. ئینجا یان ئەگیرێی‌و ئەکوژرێی، وەیان پەشیمان ئەبیتەوەو تەسلیم ئەبیت لەو کاتەش ڕسواو سەرشۆڕ ئەبیت.. منیش ووتم:- ئەی ئەگەر زانستی شەرع (فقه) فێربم؟ ووتیان:- پرسیارت لێ ئەکەنو وەڵامی خەڵی ئەدەیتەوەو فەتوای شەرعییان بۆ ئەڵێی، وە داوای ئەوەت لێ ئەکەن کە ببیتە قازی‌و کێشەی خەڵك چارەسەر بکەیت با هەرچەند بە تەمەن بچووك بیتو لاو بیت... ووتم:- هیچ زانستێك لەمە بە سوودتر نییە ئینجا خەریکی زانستی شەرع (فقه) بوومو فێری بووم.

بەم جۆرە پێشەوا ئەبوحەنیفە نەخشەی ڕێگای ئەو زانستەی بۆ خۆی دانا کە بڕیاری دابوو فێری ببێتو سوودی لێوەربگرێتو سوودیش بە خەڵکی بگەیەنێت، تاوەکو لە ئەنجامدا بووە پێشەوایەك، نازناوەکەی (پێشەوای گەورە) بوو کە هیچ پێشەوایەك ئەم جۆرە نازناوەی نەبووە.

## ٦- رابەرو مامۆستاكانی:-

پێشەوا ئەبوحەنیفە ئەو بوارەی هەڵبژارد كە پێی رازی بوو، و ئەیزانی ئەتوانێت لە میانەی دا سوود بە خۆیو خەڵك بگەیەنێت، ئەو ئێستا خەریكی هەڵبژاردنی ئەو رابەرو مامۆستایانەیە، كە ئەیەوێت زانستیان لێوە فێربێت.

لەو كاتانەی ئەنەسی كوڕی مالیك هاوڕێی بەرێزی پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی كوفەی ئەكرد، پێشەوا چاوی پێئەكەوێتو ئەچووە دیدەنی، هەروەها زانستی لە عطاء كوڕی رباحو ئەبوئیسحاق السبیعيو محارب كوڕی دثار، حماد كوڕی ئەبوسلیمان، و هیثم كوڕی حبیب الصواف، و قیس كوڕی مسلم، و محمد كوڕی مكندرو نافعی خزمەتكاری عبداللەی كوڕی عمر، و هشام كوڕی عروە، یزید كوڕی فقیر، و سماك كوڕی حرب، و علقمة كوڕی مرثد، عطیة العوفي، و عبدالعزیز كوڕ ی رفیع، عبدالكریم ابا امیة بوون.

هەروەك پێشەوا ئەبوحەنیفە چووە خزمەت چوار لە گەورە زانایانی ئەهلی بەیتی پێغەمبەر (ﷺ) كە لەنێو خەڵكی بە زانستی زۆرو ئەدەبی گەروە بەناوبانگ بوون.

بە هەمان شێوە بووە قوتابی پێشەوا زید كوڕی علی زین العابدین، ئەوەی كە لە سەردەمی هشام كوڕی عبدالملكو لە ساڵی (١٢٢)ی كۆچی شەهید بوو، هەروەك بووە قوتابی محمد كوڕی علی برای زید كوڕی علی، و بووە قوتابی پێشەوا (جعفر كوڕی محمد)ی بە ناوبانگ بە جعفری صادق،

بە هەمان شێوە بووە قوتابی عبداللە کوڕی حسن کوڕی حسن.

ئەمانە هەموویان لە زانا بژاردەو باشەکانی موسڵمانان بوون، هەموویان مامۆستای (ئەبوحەنیفە) نعمان کوڕی ثابت بوون ڕەزای خوای لێبێت.

بەڵام ئەو ڕابەرو مامۆستایەی کە پێشەوا ئەبوحەنیفە نعمان کوڕی ثابت لەلای خوێندنی تەواو کرد، زانای پایە بەرز حماد کوڕی ئەبوسلیمان بوو، ئەبوحەنیفە هەژدە ساڵی تەواو لەلای ئەو مایەوەو هاوڕێیەتی خوێندنی زانستەکانی لەلاکرد.

زانا حماد هێزو توانایەکی بەرچاوی لە ئەبوحەنیفەدا بینی لە دەرخ کردنی زانستەکانو گرنگی دان بە وانەکان، بۆیە شێخ حماد ئەبوحنیفەی لە هاوڕێکانی جیاکردەوەو، و گرنگی زیاتری پێئەدا، کاتێك ووتی:- کەس لە پێشەوەی کۆڕەکەم (کۆڕی زانستی) دانانیشی جگە لە ئەبوحەنیفە نەبێت، پێشەوا ئەڵێت:- دە ساڵان هاوڕێیەتی زانا (حماد)م کرد، پاشان دەروونم حەزی لە پێشەوایی بوو، بۆیە پێمخۆش بوو واز لە مامۆستاکەم بێنمو کۆڕی زانستی تایبەت بەخۆم هەبێت، ئینجا ڕۆژێکیان بەو مەبەستە لە ماڵ چوومە دەرەوەو بەرەو مزگەوت بەڕێکەوتم، کاتێکیش لە مزگەوت مامۆستاکەم بینی پێم ناخۆش بوو وازی لێبێنم، تاوەکو شەوێك لە شەوەکان هاتو پێی ووتم ئەیەوێت سەردانی خزمێکیان بکات لە شاری بەسرەو ماوەیەك لەوێ ئەمێنێتەوە، بۆیە داوای لێکردم لەجێی ئەو دابنیشمو کۆڕە زانستیەکەی ئەو هەڵبسووڕێنم. منیش داخوازی ئەوم

بەجێ هێناو دوو مانگ مایەوە، لەم ماوەیەشدا چەندین پرسیارم لێکرا کە لەمەوپێش نەم بیستبوو، منیش وەڵامم نەدانەوەو پاشان وەڵامەکانم نەنووسیەوە، ئینجا دوای ئەوەی لە سەردانەکەی هاتەوە پرسیارەکانم پیشاندان کە نزیکەی شەست پرسیار ببون، لە (چل)یان هاورِا بوو لەگەڵمو لەوەڵامی (بیست)یشیان وەڵامی جیاوازی هەبوو، بۆیە لەوکاتەوە بە خۆمم ووت:- تاوەکو مردن لێی جودا نابمەوە، ئینجا تاوەکو کۆچی دوایی کرد هەر لە خزمەتی مامەوە.

پێشەوا ئەبوحەنیفە رەزای خوای لێبێت، ئەڵێت:- سەردانی ئەبو (جعفر المنصور) ئەمیری موسڵمانانم کردو پێی ووتم:- ئەی ئەبوحەنیفە زانستت لە کێ وەرگرتووە؟ ووتم:- لە حماد ئەویش لە ئیبراهیم ئەویش لە عمری کوری خطابو علی کوری ئەبوطالب، و عبداللەی کوری مسعود، و عبداللەی کوری عباسی وەرگرتووە. ئینجا ئەبوجعفر ووتی:- بەه بەه، زانستت لە مامۆستایانی پایەبەرز وەرگرتووە. درودی خوایان لێبێت.

منصور شارەزابوو بەو زاناو پێشەوایانەی کە ئەبوحەنیفە وەکو سەرچاوەی زانستی خۆی بۆی باس کرد، چونکە منصور شەرع زانو فەموودە زان بوو پێش ئەوەی ببێتە جێنیشینو دەسەڵاتی ولاتی موسڵمانان بگرێتە دەست، هەر ئەویش بوو داوای لە پێشەوا مالیك کرد، کە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبکاتەوە، ئینجا پێشەوا مالیك فەرموودەکانی لە پەرتووکی (الموطأ)دا کۆکردەوە.

پێشەوا ئەبوحەنیفە رەزای خوای لێبێت چاکەکارو بە وەفا بوو لە

بەرامبەر مامۆستاکانی، ئەبوحەنیفە ووتی:- لەو کاتەوەی مامۆستا حماد کۆچی دوایی کردووە، لە دوای نوێژەکانم کاتێك داوای لێخۆشبوون بۆ دایكو بابم ئەکەم بە هەمان شێوە بۆ (حماد)یش ئەکەمو هەرگیز لە بیرم نەکردووە، هەروەها داوای لێخۆشبوونیش بۆ کەسێك ئەکەم کە زانستی لێوە فێربووم یاخود فێری زانستم کردبێت.

ووتی:- لەبەر رێزو چاکەی حماد لەو کاتەوە پێیەکانم نەچۆتە لای ماڵی ئەو لە کاتێکدا ماڵەکەیان زۆر نزیکە لە ماڵی ئێمە.

ئەبوحەنیفە بەو ئەندازە خوێندنە لای ئەم مامۆستایانەی باسمان کردن وازی نەهێنا، بەڵکو ژمارەی مامۆستاکانی گەیشتە چوار هەزار مامۆستا، لەمەشدا هیچ سەیر نییە چونکە حەفتا ساڵ ژیاو پەنجاو پێنج جار حەجی ماڵی خوای گەورەی کردووە. ئینجا لە وەرزی حەجدا زانایانی جیهانی ئیسلامی لە ماڵی خوا (کەعبە)ی پیرۆز کۆئەبوونەوە. ئەبوحەنیفە چاوی پێیان ئەکەوتو فێرە زانست ئەبوو لێیان.

## ٧- کۆڕە زانستییەکەی:-

ئەبوحەنیفە کۆڕی زانستی تایبەت بە خۆی نەبوو تاوەکو دوای کۆچی دوایی مامۆستاو رابەرەکەی (حماد کوڕی سلیمان لە ساڵی ١٢٠ی کۆچی)، کاتێك حماد کوڕی ئەبوسلیمان کۆچی دوایی کرد ئەبوحەنیفە لە مزگەوتی کوفە دانیشتو کۆڕی تایبەتی کردەوە بۆ بەهرەمەندبوونی فێرخوازان لە زانستە زۆرەکەی پێشەوادا، کۆڕە زانستییەکەی لەو کاتەدا

گەورەترین کۆڕ بوو، زیاترین فێرخوازانی لە دەوری خۆی کۆکردبووەو، سەرەڕای ئەوەی لەناو هەمان مزگەوتدا چەندین کۆڕ هەبون، بۆ قورئان لەبەرکردن‌و فەرموودە لەبەرکردن‌و خوێندنی- جۆرەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، جگە لەم کۆڕانەش، لەگەڵ ئەو هەموو کۆڕە زانستیانە لەنێو مزگەوتی کوفە بەڵام کۆڕی پێشەوا ئەبوحەنیفە تایبەتمەندو بەرچاوو دیاربوو چونکە لەنێو کۆڕەکەیدا باشترین فێرخوازو لاو هەبوون گوێ بیستی فەرمایشتە زانستییەکانی پێشەوا ئەبوون، وە ئەگەر پێشەوا فەرزی حەجی بەجێ بهێنایەو رۆیشتبایە شاری مەککە ئەوا کۆڕە زانستییەکەشی ئەگوازرایەوە (مسجد الحرام) لەنێو شاری مەککە، چونکە ناوبانگی پێش خۆی کەوتبوو، وە ئەگەر رووی سەردانی بکردبایە مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لە شاری مەدینە ئەوا کۆڕە زانستییەکەشی ئەگوازرایەوە رەوزەی پیرۆز.

بەم جۆرە ئەتوانین بڵێین کەسانێك لەلای ئەبوحەنیفە ئەیانخوێند کە ناویان بنێین قوتابی لە ئاستێکی باڵا لە (زانست خوێندندا)، هاونشینانی کۆڕە زانستیەکەی ئەبوحەنیفە لە خەڵکی ئاسایی نەبوو وە هەروەها لەوانەش نەبوو کە تازە دەستیان بە خوێندن‌و زانیاری کردبێت، بەڵکو تیایاندا هەبوو ئەندازەیەکی زۆری لە شەریعەت‌و (فقه)دا خوێندبوو. ئەگێڕنەوە رۆژێکیان پیاوێك لە کۆڕی ((وکیع بن جراح الفقیه)) ووتی:- ئەبوحەنیفە هەڵەی کردووە، وەکیع کوڕی جەراحیش پێی ووت:- چۆن ئەتوانیت بڵێیت ئەبوحەنیفە هەڵە ئەکات لە.کاتێکدا یەکێکی وەکو ئەبو

یوسف‌و هاو وێنەی ئەوان، و وێنەی یحی کوڕی ئەبو زائدە، و حفص کوڕی غیاث، و حبان ومندل لە شارەزایی‌و دەرخ کردنی فەرموودەدا، و قاسم کوڕی معن لە شارەزایی زمانی عەرەبیدا، و داودی طائی‌و فضیل کوڕی عیاض لە زوهدو تەقوادا، چونکە هەر کەسێك ئەمانە هاونشینانی بن نزیکە هەرگیز هەڵە نەکات، چونکە ئەگەر هەڵە بکات بۆی راست نەکەنەوە.

ئا ئەمەبوو هاونشینانی ئەبوحەنیفە کە تیایاندا زانای شارەزاو هەڵکەوتووی تێدا هەبوو لە بوارەکانی زانستدا، ئەچوونە خزمەت ئەبوحەنیفە چونکە جگە شارەزایی، ئەبەحەنیفە زۆر وورد بوو لە روونکردنەوەی زانستەکاندا ئەمە هۆکارێك بوو کە کۆڕی ئەبوحەنیفە کۆڕی خوێندن‌و فەتوابێت لە نێوان ئەم پایە بەرزانە، وە ئەو شایەنی زیاتریشە.

## ٨- پلەو پایەی لە نێوان پێشەواو زانایانی سەردەمەکەی:-

ئەبوحەنیفە پایەیەکی گەورەی هەبوو لە نێوان زاناو پێشەوایانی سەردەمەکەی، قەدەری خوا وابوو پێشەوا ئەبوحەنیفە لە چوار پێشەوایەکە، پێشی هەموویان لە دایك بێت‌و لە پێش ئەوانیش کۆچی دوایی بکات، بۆیە شایانی ئەوەبوو پێش ئەوانی تر باس بکرێت.

ئەبوحەنیفە بێ رێزو پایەیەکی کەم نرخی نەبوو، بەڵکو لە چەند روویەکەوە پیاوێکی گەورە بوو، چونکە لە ژیانی کاروباری رۆژانەی خۆیداو

لە کۆششدا سەرکەوتووبوو، بە هەمان شێوە لە خوێندندا بلیمەتو شارەزابوو، و پسپۆڕ بوو لە بیرکردنەوەو دەرهێنانی حوکمە شەرعیەکاندا، و خاوەن رەوشتێکی بەرزبوو، بەهۆی ئەم خەسڵەتانەوە....لەو پێشەوایانە ئەژمێردرا کە بە پەنجە ئاماژەیان بۆ ئەکرێت.

ئەمە بەسیەتی کە نازناوی (پێشەوای گەورە) (الامام الاعظم)ی بۆ خۆی مسۆگەر کردبوو، و شەرعزانی عێراقو خاوەن راو بۆچوونەکانی بوو.

((عبداللەی کوڕی مبارك)) لەبارەیەوە ئەڵێت:- ((ئەو مۆخی زانست بوو)). کوڕی جریح لەبارەیەوە ئەڵێت:- ((زۆر شارەزابوو)) وە زاناو پێشەواو شەرعزانو بە زوهدو تەقوا (فەضیلی کوڕ ی عیاض) لە بارەی ئەبوحەنیفەوە ئەڵێت:- ((ئەبوحەنیفە پیاوێکی شەرعزانو شارەزاو ناسراو بوو، وە بە خواپەرستو وەرع بەناوبانگ بوو، دەوڵەمەند بوو، خاوەن خەسڵەتو ئاکاری جوانو بەناوبانگ بوو لەگەڵ دەوروبەرەکەی)).

بە ئارام بوو لە فێرکردنی زانست بەشەو بەرۆژ، زۆر بێ دەنگو کەم قسەی ئەکرد، لەوکاتەش کە (بابەتێکی یان) لە بارەی حەڵاڵ یان حەرام لێ بپرسیبا، بە ووردی لێی ئەکۆڵییەوە، موڵكوماڵی لە دەسەڵاتداران وەرنەئەگرتو لەبەری رانەکرد، لە راستیدا رێزو پلەیەکی گەورەی هەبوو لەنێو هەموو خەڵكو پێشەوایە بەرێزەکان.

لە کۆتاییدا ئەبوحەنیفە دیاردەیەکی ناوازە بوو شارەزا لە شەرعو فەتوا و تەقواو خواپەرستیدا هەتاوەکو ئەم رێزو پایە گەورەیەی بۆ خۆی مسۆگەر کرد.

## ٩- سەرچاوەکانی شەرعی پێشەوا:-

لەو ئیشە دانپیانراوانەیە کە ئەبوحەنیفە دانەری زانستی فیقە (شەریعەت)و دامەزرێنەری قوتابخانەی فیقهە لە ئیسلامداو بە هەمان شێوە چەسپێنەری کۆڵەگەو شێوازی روونکردنەوەی ئەمەیە.

پێشەوا ئەم کۆڵەگانەی (فقیه) و شێوازەکەو دامەزراندنی قوتابخانەی (فیقە)ی لەسەر بۆشایی بنیات نەنابوو، بەڵکو زانابوو بە پەرتووکی خوا (قورئان)و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و شارەزاش بوو لە کاروبارەکانی دینو دونیادا.

پێشەوا (ﷺ) سەرچاوەی فیقهی لە سەرچاوە ساغو دروستەکاندا وەرگرتووە، لەم بارەیە وەك روونکردنەوەیەك بۆ شێوازی هەڵێنجانی بڕیاری شەرعیو سەرچاوەی بڕیارەکان، ئەڵێت:- ((بڕیارەکە لە قورئان هەڵدێنجم، ئەگەر لە قورئاندا نەبوو ئەوا لە سوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)دا، وە ئەگەر نە لە قورئانو نە لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوو ئەوا لە بیرو رای هاوەڵان (صحابە)ەکان وەردەگرم، وە ئەگەر ئەم دۆزییەوە وەکو زاناو پێشەوایانی پێش خۆم تێنەکۆشم بۆ روونکردنەوە، و وەڵام دانەوەی پرسیارە، کراوەکە)).

ئەمە سەرچاوەکانی فیقهو شارەزایی شەریعەتی پێشەوا ئەبوحەنیفە بوو، کە بە روونی بڕیاری لەسەر داوە.

پێشەوا (ﷺ)قورئانی لەبەربوو، شەوو رۆژ ئەیخوێندەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەکرد بۆ دەرهێنانی حوکمو بڕیارەکان لەبەر



ڕەزامەندی خـوای گـەورە، (بەهـەمان شـێوە شـارەزا بـوو بـە سـوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەکردەوەو گوفتارو ژیاننامەکەیو فـەرموودە ناسـێکی بە تواناو لێهاتوو بوو) فـەرموودەکانی پێغەمبـەری (ﷺ) لەبەر بـوو، فەرموودەکانی لە زاناو شارەزایانی عێراقو حیجاز وەرگرتبـوو، هـەروەك شارەزابوو بە ووتەی صەحابەکان بە هەموو شـێوەکان لـەوەی بـیرو رایـان لەسەری کۆکە، یاخود جیاوازییان لە بیروڕادا لەسەری هەیە، خوای گەورە تەقواو تێگەیشتنو دڵسۆزیو راستگۆیی پێبەخشی بوو، بەهـەمان شـێوە مامۆستای رابەرو زاناو تێگەیشتووو پێگەیشتووی پێبەخشی بوو.

## ١٠- قوتابییەکانی پێشەوا:-

قوتابخانـەی پێـشەوا ئەبوحەنیفـە کـۆڕێکی زانـستی بـوو، چـونکە مامۆستاکەی، مامۆستایەکی بەڕێزو خاوەن پلەوپایەیەکی باڵای زانستی، و رەوشتی چاكو بەرز بوو، بۆیە ئەو قوتابییانەی لـە دەوری کۆتەبوونـەوە کە هۆکاری خوێندنی نموونەییو ژیانی خۆشیانو نازادو کراوەو سەربەست بوون لە رادەربڕینو بەیەکەوە بە راوێژ لێکۆڵینەوەی بابەتە زانـستیەکانیان ئەکردو بەدواداچـوونی بابەتـەکانیانو روونکردنـەوەیان بـۆ ئـەنجام ئـەدا، پێـشەوا بابەتـەکانی یەکـە بەیەکـە ئەخـستە بـەردەم قوتابییـەکان و توێژینەوەیان لەسەر ئەکردو رای خۆیان لە بارەوەوە ئەداو پێشەواش گوێی بۆ ئـەگرتنو گفتوگـۆی لەگـەڵ ئـەکردن ئینجـا بـیروڕای خـۆی بـۆ روون ئەکردنەوە بۆ ئەوەی کەسێکی بـە توانـاو لێهاتوویـان لێ دەربـچێ بۆیـە دەربڕینی بیروڕای خۆی ئەخستە دواوە، تاوەکو کارامەییو تێگەیـشتنیان



زیاتر بکات، هەتاوەکو یەکێك لە رایەکان لەبارەی بابەتەکەوە جێگیر نەبوون پاشان ئەبو یوسف لە (توصول)ەکان دای ئەنا، تا هەموو بنچینەکان بە تەواوی جێگیر ئەبوون.

لە راستیدا کۆڕی ئەبوحەنیفە کۆڕێکی (قوتابخانەیەکی) ناوازەو دەگمەن بوو لە جۆری خۆی، زۆرێك لە کەڵە زانایان لە بوارەکانی (فیقه)و دادوەران (قضاة) لە قوتابخانەکەی ئەودا دەرچوون.

قوتابییەکانی پێشەوا دوو جۆر بوون:-

بەشی یەکەم:- بەردەوام لەگەڵ پێشەوادا بوونو ئامادەی خوێندنو تێگەیشتنی زانستەکانو لەبەرکردنی بوون، تەنها لەبەر هۆکاری زۆر ناچاری نەبووایە لە پێشەوا دانەئەبڕان، ژمارەیان سی‌و شەش قوتابی بوون، لەوانە هەشتیان بۆ دادوەری کردن ئەگونجان، شەشیان بۆ فتواو بڕیاردانی شەرعی ئەگونجان، وە دوویان بۆ ئامۆژگاری کردنی دادوەرانو خاوەن فەتواکان ئەگونجان ئەویش (ئەبو یوسف)و (زفر) بوون.

بەشی دووەم:- لەو جۆرە خوێنکارانە بوون کە بە ئەندازەی پێویست زانستیان ئەخوێندو پاشان ئەگەڕانەوە شوێنی نیشتەجێ ی خۆیان، ئەمانەش ژمارەیان زۆر بوون.

بەم جۆرە خوای گەورە ڕێزی لە پێشەوا نا بەهۆی قوتابییە بەڕێزەکانی کە چیایەك بوون لە زانست، بەیەکەوە بڕیاریان لە پرسەکان ئەدا، و بناغەی یاساکانیان دائەنا، وە بەهۆی ئەوانەوە لە هەڵەکردن خۆی ئەپاراست کاتێك نزیك ئەبو بڕیارێکی هەڵە دەربکات.

## ١١- وەسیەتەکانی پێشەوا:-

پێشەوا چەند وەسیەتی پڕ بایەخی هەن کە بەڵگەن لەسەر ناسینی دەروونی خەڵکیو شارەزایی کاروبارەکانی ژیانیان، لەمەودوا خۆشەویستانم لەبەرخوا ئەم وەسیەتەو بۆ باس ئەکەم تکام وایە لەبەری بکەنو پابەندبن پێیەوە تاوەکو رەزامەندی خوای گەورە بەدەست بهێننو دواتریش بتانباتە ئەو بەهەشتەی کە چاو نەیبینیەو، گوێ نەیبیستووە، و بەسەر دڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە.

ئەو وەسیەتەی بۆتان باس ئەکەم بەم جۆرەیە:-

پێشەوا ئەبوحەنیفە وەسیەتی قوتابییەکی خۆی (ئەبو یوسف) ئەکاتو ئەڵێت:-

((رێز لە دەسەڵاتدار بگرەو شوێنەکەی بە گەورە بزانە، کاتێک لەلای ئەوی خۆت بپارێزە لە درۆکردن، لە هەموو کاتو بارو دۆخێکدا سەردانی مەکە، مادام بۆ پێویستیەکی زانستی بانگت نەکات، چونکە ئەگەر لە بیرورِادا زۆر جیاواز بووی لەگەڵی، بە کەمت سەیر ئەکاتو سووک ئەبیت لەبەرچاوی، خۆت وابێنە بەرچاو کە لە نزیک ئاگری، سوودی لێببینەو، دوورکەوە لێی، و نزیک مەبەوە چونکە زیانت پێ ئەگات، لەبەر ئەوەی سوڵتان (دەسەڵاتدار) وەکو قازانجو سوودی خۆی ئەبینێت، وەها سوودی خەڵکی نابینێت.

خۆت بپارێزە لە زۆر قسەکردن لە نزیکیدا، چونکە بەهۆی قسەی زۆری خۆتەوە کە هەڵە ئەکەی ئەکاتە بەڵگە لەسەر نەزانینی تۆو زانایی ئەو

(واتە: سوڵتان) لەلای دەستو پێوەندەکەیدا، هەروەها بە هەڵەت دائەنێت بەمەش لەبەرچاوی خەڵکی سووك ئەبێت.

وەهابە کە چوویتە لای ئەو ڕێزی تۆو ڕێزی کەسانی دیکەش بزانن، کاتێك زانایەکی لەلایەو تۆ نایناسی سەردانی سوڵتان مەکە چونکە ئەگەر تۆ لە ئەو لەدەسەڵاتدار نزیکترو بارودۆختو باشتربوو لەوانەیە ببێتە هۆکاری ئەوەی لەبەرچاوی سوڵتان سووك ببێت، ئەگەر ئیشێکی پێسپاردی لێی وەرمەگرە تەنها دوای ئەوەی بزانی لە تۆو بیرو ڕا زانستیو دادوەرییەکانت ڕازیە، تاوەکو پێویست نەکات ڕێبازی جگە لە تۆ لە چارەسەری کێشەکاندا هەڵببژێرێت.

سەردانی پشتو پەناو دارو دەستەی دەسەڵاتدار مەکە، بەڵکو تەنها لە سوڵتان نزیك بەرەوەو لە دارو دەستەکەی دووریکەرەوە، تاوەکو پلەو ڕێزت هەمیشە بە بەرزی بمێنێتەوە.

لەلای خەڵکی ئاسایی قسە مەکە تەنها کاتێك وەڵامی پرسیارەکانیان ئەدەیتەوە، خۆت بپارێزە لە قسەکردن لەبارەی مامەڵەو بازرگانیدا تەنها لەرووی زانستیەوە نەبێت، تاوەکو ئارەزووت نەچێتە سەر خۆشویستنی ماڵو دەستی بۆ درێژ بکەی.

پێمەکەنە لای خەڵکی ئاساییو زۆر زەردەخەنەش مەکە، زۆر مەچووە بازاڕ، قسە لەگەڵ هەرزەکاران مەکە چونکە (بەلا)ن، بەڵام ئاساییە قسەکردن لەگەڵ منداڵو دەست بەسەرداهێنانی یان، لەگەڵ مرۆڤی بەسالاچووو پیردا بە ڕێگادا مەڕۆ، چونکە ئەگەر وەپێش خۆیان بخەی ئەوا

به سووك سەیركردنی زانستی خۆتە، وە ئەگەر وە دویان بخەیو تۆش لە پێشیان برۆی ئەوە رێز نەگرتنی ئەوانە لە رووی تەمەنەوە، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:- ((لە ئێمە نییە كەسێك رێز لە گەورە بە تەمەنەكان نەگرێت، و میهرەبانی نەنوێنێت لەگەڵ بچووكەكاندا)).

لەسەر رۆخی رێگادا دامەنیشە، ئەگەر بانگ كرای بۆ ئەمە ئەوا لە مزگەوت دابنیشە، و لە دوكان دامەنیشە، وە خواردن لە مزگەوتو بازاڕ مەخۆ، ئاوی ئاوگێڕ مەخۆرەوە، پۆشاكی رازێنراوەو ئاوریشم مەپۆشە، چونكە ئەمە سەر ئەكێشێت بۆ دڵ رەقیو هەڵەشەیی لە كاردا.

قسەی زۆر مەكە لەگەڵ خێزانەكەت لەبارەی جێگادا، تەنها لەكاتی پێویست نەبێ بۆ ئەمە، و زێدەڕۆیی مەكە لە دەست لێدانو كۆبوونەوە لەگەڵی، هەمیشە یادی خوات لەلابێتو داوای خێرو چاكە بكە لەلای خوا لە نزیك بوونەوەیدا، باسی ئافرەتانی بێگانەو جاریە لەلای خێزانەكەت مەكە، چونكە ئەمە گفتوگۆی دیكەی بەدوادا دێتو لەوانەیە ئەگەر تۆ باسی ئافرەتی بێگانە بكەیت ئەویش باسی پیاوی بێگانە ئەكات. ئەگەر لە توانات دابوو ژنێك مەخوازە كە پێشتر مێردی هەبوویێت یان باوك یان دایك یاخود كچی هەبێت، تەنها بەمەرجی ئەوەی هیچ كەسێك لە خزمو كەسەكانی دەست وەرنەداتە كاروبارەكانی ژیانتەوە، سەردانیماڵی بابی مەكە تا بۆت ئەكرێت.

خۆت بپارێزە لەوەی ماڵت لەنێو ماڵی ئەواندا بێت چونكە ماڵەكەت ئەبەنو تەماع ئەخەنە سەر ماڵو مولكت، خۆت بپارێزە لە خواستنی

ژنێك كە كچ‌و كوڕی هەبێت، چونكە هەموو پارەو پول بۆ ئەوان هەڵدەگرێت، و پارە ئەدزێت‌و لە خزمەتكردنی ئەواندا خەرجی ئەكات چونكە رۆڵەكانی لە تۆ خۆشەویسترە لەلای ئەو. دوو ژن لەیەك خانوودا كۆمەكەرەوە، ژن مەهێنە تاوەكو ئەزانی كە ئەتوانی هەموو پێداویستیەكانی بۆ دابین ئەكەیت، یەكەم جار داوای زانست بكەو بخوێنە، دوایی ماڵ‌و دارایی حەڵاڵ كۆبكەرەوە، ئینجا ژن بهێنە، چونكە لەكاتی خوێندندا خەریكی ئیشكردن بیت، ئەوا بە گوێرەی پێویست ناتوانی بخوێنیت، خۆت بپارێزە لە خەریك بوون بە خێزان‌و ژنەوە پێش خوێندن، چونكە كاتت بەفیڕۆ ئەدەن، و منداڵت لە دەور كۆئەبنەوە، و خێزانت زۆر ئەبێت، تۆش پێویستە پێویستیەكانیان جێبەجێ بكەیت‌و واز لە زانست بهێنیت.

لە تافی لاوێتیداو كاتی بە تاڵ بوونی دڵ لە مەشغەڵەت‌و بیركردنەوەدا خەریكی خوێندن بە، پاشان خەریكی كۆكردنەوەی ماڵ‌و دارایی ببە، چونكە زۆر بوونی منداڵ‌و خێزان ژیری‌و دڵ خەریك ئەكەن. ئینجا ئەگەر ماڵت هەبوو خەریكی ژن هێنان بە.

خواپەرستی‌و تەقوای خوابكە، ئەمانەت‌و راسپاردە بە تەواوی بەجێبهێنە، ئامۆژگاری هەموو خەڵكی بكە ئاسایی بێت یاخود خەڵكی تایبەت. خەڵكی بەكەم مەزانە‌و رێزیان بگرە، زۆر تێكەڵی خەڵكی مەبە تەنها پاش ئەوەی هاتوچۆت ئەكەن، ئینجا ئەگەر سەردانیان كردی باسی بابەتی زانستیان بۆ بكە ئەوكات ئەگەر حەزیان لە زانست بێت سەردانت

ئەکەن، وە ئەگەر حەزیان لیّ نەبیّت خۆت لیّ ئەپاریّزن. ئاگاداربەو خۆت بپاریّزە لەوەی باسی بنچینەی ئاینو زانستی (کلام) بۆ خەڵکی ئاسایی بکەی، چونکە ئەمانە کەسانیّکن شویّنت ئەکەونو خۆیانی پیّوە خەریك ئەکەن. هەر کەسیّك هاتو پرسیاری روونکردنەوەی بابەتیّکی لیّکردی، تەنها وەڵامی پرسیارەکەی بدەوە، زیاتری بۆ باس مەکە، چونکە سەری لە وەڵامەکە تیّك ئەچیّ.

ئگەر هاتوو (١٠) ساڵان بەبیّ کاروکاسبیو خۆراك مایەوە پشت لە بەرنامەو زانستی خوا مەکە چونکە ئەگەر هاتوو پشتت تیّکرد ئەوا ژیانیّکی ناخۆش بەسەر ئەبەیت، چونکە خوای گەورە ئەفەرموویّت:- ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ئەوەیش رو وەربگیّریّت لە بەرنامەو یادی منو پشتی تیّ بکات، بیّگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانیّکی ترشو تاڵو ناخۆش پیّش دیّت)) (سورة طه، ١٢٤) تەفسیری ئاسان.

وەکو منداڵو رۆڵەی خۆت هەڵسوکەوت لەگەڵ قوتابییەکانت بکەو هەموویان بە رۆڵەی خۆت دابنیّ، تاوەکو حەزو ویستیان بچیّتە سەر خویّندنو زانیاری. مشتومڕ لەگەڵ خەڵکی ئاساییو بازاڕ ی مەکە ئەگەر هاتوو مشتومڕیان لەگەڵ کردی، چونکە کەم ریّز ئەبی لەلای ئەوان، لە وتنی (راستی)دا شەرم لە هیچ کەسیّك مەکە، با هەرچەند دەسەڵاتدارو پاشا بیّت. لە ئەنجامدانی پەرستشەکان لە خۆت رازی مەبە تەنها لەو کاتەی کە پەرستشی زیاتر لە خەڵکی ئەنجام بدەیت، چونکە ئەگەر هاتوو

خەڵكی ئاسایی بینیان تۆ كەمتر لەوان روو لە پەرستش ئەكەیت. وا بـڕوا نەكەن كە تۆ خراپیتو حەز بە پەرستنی خوا ناكـەیت، هـەروەها بـڕواش نەكەن كە زانستەكەت سـوودت پێناگەیـەنێت هـەروەك نـەزانینی ئـەوان سوود بە ئەوان ناگەیەنێت.

ئەگەر چوویتە شارێكو تیایدا كەسانی خاوەن زانستی لێ هەبوون ئـەو شارە بە هی خۆت دامەنێ، بەڵكو (خۆت) وەكو ئەندامێكو هاوڵاتییەكی ئەوێ بژمێرە، تاوەكو ئەوان بزانن مەبەستی تۆ لە هاتنت بۆ شارەكە رێزو پلەی ئەوان نییە. نـەوەك زانایـەكان لێـت وەدەنـگ بـێنو بەربـەرەكانێت بكەنو پشتت تێبكەنو رەخنـە لـە بـیرو باوەڕەكانـت بگـرن، و بەمـەش خەڵكی (ئاسایی)ش لێت بتۆرێنو تەماشات بكەنو پشتت تێبكەنو بەبێ سوودی لەوێ بە تەنها بمێنیەوە.

بڕیـارو فـەتوایان بـۆ مـەدە بـا هەرچـەند پرسیاریـشت لێبكـەن، مشتومڕیان لەگەڵ مەكـە لـەكاتی ووتو وێـژكردنو گفتوگۆكردنـدا تـا بەڵگەی روونو تەواوت پێنەبێت باسـی هیـچیان بـۆ مەكـە، رەخنـە لـە مامۆستاكانیان مەگرە چونكە رەخنەت لێئەگرن، وە بە ئاگاییـەوە لەگـەڵ خەڵكی بە، بە نهێنیو ئاشكرا بۆ خوای گەورە بژێی ئیشی (زانـا) تـەواو دروستو ساغ نابێت تاوەكو نهێنیو ئاشكرای وەكو یەك نەبن.

ئەگەر دەسەڵاتدار كارێكی گونجاوی پێسپاردی وەری مەگرە تەنها ئەو كاتە نەبێت ئەگەر هاتوو بزانیت لەكاتی وەرنەگرتنی تۆ یەكێكی تـر ئـەم كارە بگرێتە دەست، و زیان بە خەڵكی بگەیەنێت، و دوای ئـەوەی بزانـی

که هۆکاری زانستەکەتە بۆیە داوای کار پێسپاردنی لێنەکات.

لەکاتی ترس‌و ناخۆشیدا خۆت بپارێزە لە ووت‌و وێژکردن، چونکە ئەمانە هۆکاری بۆ نەهاتنی ووشەکان‌و ناتەواوی دەربڕینە.

خۆت بپارێزە لە زۆر پێکەنین چونکە دڵ ئەمرێنێت. گفتوگۆی زۆر لەگەڵ ژنان مەکەو لەگەڵیان دامەنیشە، چونکە هۆکاری مردنی دڵە، بە هێمنی‌و لەسەرخۆوە بەرێدا برۆ، سەرەڕۆ مەبە لە کارەکاندا کەسێك لە دواوە بانگی کردی وەڵامی مەدەوە، چونکە گیانلەبەران لە دواوە بانگ ئەکرێن! ئەگەر قسە بکەی زۆر هاوار مەکە، و دەنگت بەرز مەکەوە، دامەزراوی‌و کەم جوڵاوی بکە بە عادەتی خۆت، تاوەکو خەڵکی بە کەسێکی دامەزراوت بژمێرن.

لە نێوان خەڵکی زۆر یادی خوا بکە تاوەکو ئەوان لە تۆوە یادکردنی خوای گەورە فێربن، لە دوای هەموو نوێژێك بیکە بە یاسا بۆ خۆت کە یادی بکەی‌و تیایدا قورئان بخوێنی، خوای گەورەت لە بیر بێت‌و سوپاسی خوا بکە لەوەی ئارامی‌و نیعمەتی بەسەردا ڕژاندووی، بیکە بە یاسا هەموو مانگێك چەند رۆژێکی دیاریکراو بە رۆژو ببە، تاوەکو خەڵکی چاو لە تۆ بکەن، بە ئەندازەی ئەو پەرستشانە رازی مەبە کە خەڵکی پێی رازی ئەبن بەڵکو زیاتر لەوان ئەنجام بدە.

لێپرسینەوە لەگەڵ خۆت بکەو چاودێری بکە، زانستەکەت بپارێزەو لە یادی مەکە، تاوەکو ببێتە هۆی سوودبەخشی بۆ تۆ لە دونیاو دوارۆژ. کڕین‌و فرۆشتن بەخۆت مەکە بەڵکو یەکێکی گونجاو هەڵبژێرە تاوەکو

هەڵسێت بە کاروبارەکانتو پشتی پێ ببەستە لە کڕینو فرۆشتنی پێداویستیەکان.

دڵنیاو ئاسوودە مەبە لە دونیاو ئەوەی هەتە چونکە خوای گەورە لە هەموو ئەمانە لێپرسینەوەت لەگەڵدا ئەکات. حەزو ویستی نزیك بوونەوە لە دەسەڵاتداران لە خۆتدا دەرمەخە، با هەرچەندە ئەوان لە خۆیان نزیکت بکەنەوە، چونکە ئەوان ئیشت پێئەکەن، ئینجا ئەگەر هاتوو بۆیان جێبەجێ بکەیت بە چاوی سووك سەیرت ئەکەن وە ئەگەر بۆیان نەکەی رەخنەت لێئەگرن.

بە شوێن هەڵەی خەڵکیدا مەگەڕێ، بەڵکو شوێن کارە چاکەکانیان بکەوە، ئەگەر خراپەت لە یەکێك بینی خراپەکەی باس مەکە، بەڵکو داوای خێرو چاکەی بۆ بکەو باسی چاکەکانی بکە، تەنها لە باسی ئایندا ئەگەر خراپ بوو، تۆش خراپی ئەوت زانی باسی خراپەکە بۆ خەڵکی بکە تاوەکو خەڵك خۆی لێ بپارێزنو شوێنی نەکەون. پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێت:- ((باسی خراپەی خراپەکار بکەن تاوەکو خەڵکی خۆی لێ بپارێزن)). لە مرۆڤی دەسەڵاتدارو دەوڵەمەند مەترسە، چونکە ئەگەر لێیان نەترسی ئەوا خوای گەورە پشتو پەناو یارمەتیدەرتە. خەڵك لێت نەترسنو رێزت ئەگرن ئەگەر هاتوو ئامۆژگاری دەسەڵاتداری لەڕێ دەرچوو بکەی نەك شوێنی خراپەکەی بکەوی. بیری مردن بکەو لەلای خوای گەورە داوای لێخۆشبوون بکە بۆ مامۆستاکانتو ئەوانەش کە زانستت لێ وەرگرتوون. بەردەوام بە لە قورئان خوێندنو زۆر سەردانی گۆڕستان بکە.

لەگـەڵ مرۆڤـی خراپـەکار دامەنیـشە تـەنها ئـەو کاتـەی کـە ئەتـەوێت ئامۆژگاری بکەیتو رێگەی راستی (خوای گـەورەی) پـێ نیـشان بـدەی. جوێنو قسەی خراپ بە کەس مەڵێ. ئەگەر بانگ بێژ بـانگی ووت خـۆت ئامادە بکە بۆ چوونە مزگەوت خۆت بپارێزە لـە رژدیو چـروکی چـونکە ئابرووی مرۆڤ ئەبات، چاوچنۆكو درۆزن مەبە. پۆشاکی سپی لـە هـەموو بارودۆخێکدا بپۆشە، ئەگەر بە رێگەدا رۆیشتی سەیری زەوی بکـەو ئـاوڕ بەلای راستو چەپدا مەدەوە.

لە نزاو پاڕانەوەی باشت لە بیرمان مەکە. ئەم ئامۆژگارییە وەربگـرەو بەجێ ی بهێنە. چونکە بۆ بەرژەوەندی تۆو موسڵمانانە)). بەم جـۆرە ئـەم وەسیەتە زۆر بابەتی گرنگی لە نێوەخـۆ گرتـووە، تکاوایـە لەبـەربکرێتو شوێن ئامۆژگاریەکانی ناوی بکەوە.

## ١٢- دانراوەکانی:-

سەردەمی پێشەوا، سەردەمی نووسینو دانـان نـەبوو، پێـشەواش لـەو زانایە نەبوو کە خۆی تەرخان کردبێت بۆ نووسینو دانـانی پـەرتوك بـەڵکو شەو تا بەیانی شەونوێژی ئەکرد، ئینجا لـەکاتی بـوونی نوێـژی بـەیانی، نوێژەکەی بەجێ ئەهێنا پاشان لە مزگەوت دائەنیشتو خەڵکی فێر ئەکرد تاوەکو چێشتەنگاو، دوایی بـۆ بـەجێهێنانی پێویـستیەکانی ئەڕۆیـشتەوە ماڵەوە، ئینجا ئەچـووە بـازاڕ تـا ئاگـاداری کـاری بازرگـانیو کاروبـارە دنیاییەکانی بێت، سەردانی نەخۆشی ئەکرد، یان شوێن لاشـەی مردووێـك

ئەکەوت بۆ ناشتنی مردووەکە، یاخود سەردانی هاوڕێیەکی ئەکرد. لە نێوان نیوەڕۆو عەسریش ئەخەوت، پاشان دوای ئەنجامدانی نوێژی عەسر دائەنیشت بۆ فێرکردنی خەڵکی‌و وەڵام دانەوەی پرسیارەکانیان، بەمجۆرە وانە ووتنەوەکەی شوێنی کاتی نوسینو دانانی پەرتوکی گرتبووەوە. بۆیە پێشەوا رەحمەتی خوای لێبێت دانانو نوسینی پەرتوکی زۆری ئەبو کە گونجاوو شیاوی پلەو پایەی زانستییەکەی ئەو بێت.

لە دانراوەکانی پێشەوا پەرتوکی (الفقـة الاكبر)و (الفقـة الاوسط) لە زانستی (کلام)و پەرتوکی (العالم والمتعلم)، پەرتوکی (الرسالة الى مقاتل بن سليمان صاحب التفسير)و پەرتوکی (الرسالة الى عثمان البتي فقية البصرة)و پەرتوکی وەسیەتنامە کە چەندین وەسیەتی دەنێوەخۆ گرتووەو بۆ هاوڕێ یەکانی نوسیوە،و پەرتوکی (الرد على القدرية)و پەرتوکی زانست بوون.

ئەم پەرتوکانەی باسمان کردن هەموو ئەو پەرتوکانە نین کە ئەبو حەنیفە لە دوای خۆی بەجێی هێشتبێ، بەڵکو لە راستیدا زۆرێك لەو پەرتوکانەی کە هاوڕێیەکانی دایان ناون- بەتایبەتی دوو هاوڕێ نزیکەکەی ئەوانیش:- ئەبو یوسفو محمد کوڕی حەسەن- لە راستیدا هی پێشەوان، خۆی پێدا چۆتەوەو رێنوسەکەی هی ئەوەو لە ناوەڕۆکەکانی رازی بووە (واتە تەنها نوسینەکەی هی ئەوان بووە، گۆتنو بیرۆکەکەش هی پێشەوا بووە- وەرگێڕ). ئەمانە هەرچەندە ناوی دیکەی لەسەرە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم پەرتوکانە هی پێشەوا نییە، بۆ نمونە پەرتوکەکانی

(السير الصغير والسير الكبير) ناوی (محمد كوڕی حسن)ی لەسەرەو وەكو پەرتوكی (المبسوط) ناوی دانەرەكەی هەمان محمدی كوڕی حسنی لەسەرە، كە ئەو بابەتو پرسیارانە دەنێوەخۆ ئەگرێت، ئەبو حەنیفە فەتواو بڕیاری شەرعی لەسەرە داوە. وە بۆ نمونە هەردوو پەرتوكی (الآثار) یەكێكیان لە دانانی ئەبو یوسف، ئەوی دیكەش لە دانانی محمد، وە هەردوو پەرتوكەكەش لە ڕێنوسی پێشەوای گەورەیە.

## ١٣- بەڵاو نەخۆشیەكانی پێشەوا:-

هەندێك جار مرۆڤ سەری سوڕ ئەمێنێ لەوكاتەی گوێ بیست ئەبێت یاخود ئەبینێت زانایانی موسڵمانان ئەزیەتو ئازار ئەدرێن، بەڵام ئەمە سەیرو نامۆنییە، چونكە هەموو پێغەمبەران ناخۆشییان دیوەو ئازاریش دراون، وە زانایانیش نزكترین كەسانێكن لە پێغەمبەران لە ڕووی شوێن كەوتنندا، چونكە زانایان باشتر لە خەڵكی ئاسایی پێغەمبەران ئەناسن، ئەمەش بەهۆی ئەو زانستەی هەیانە، توانیویانە شوێن پێی پێغەمبەران بكەون، ئێمە ئێستا لەگەڵ پاڵەوانێك یاخود چیایەك لە خۆڕاگری داین لەسەر ناخۆشیەكان، ئەویش پێشەوا ئەبوحەنیفە، كە خوای گەورە بەهۆی ئەم ناخۆشیو بەسەرهاتە ئازار بەخشانەوە پێیەوە تاقیكردۆتەوە، هەندێك لەو ناخۆشیو تاقیكردنەوانە باس ئەكەین تاوەكو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئێمەو بتوانین لەسەر ڕچەو شوێنی ئەو بە ڕێگەدا بڕۆین.

## بەلاو تاقیکردنەوەی یەکەم:-

لە ساڵی (١٢٧)ی کۆچی‌و ڕۆژانی سەردەمی جێنشین مروان کوڕی محمدی ئەمەوی، لەوکاتەی لەڕێ دەرچووەکان (الخوارج) بە سەرکردایەتی (الضحاك بن قيس الشيباني) کوفەیان داگیرکرد، ضحاك‌و کۆمەڵێك لە یاریدەدەرانی چوونە لای ئەبوحەنیفەو داوایان لێکرد تەوبە بکات‌و پەشیمان ببێتەوە، پێشەواش وتی: لەچی پەشیمان ببمەوە؟ دووبارە ضحاك فەرمانی پێکرد تەوبە بکات‌و پەشیمان ببێتەوە، پێشەواش وتی: لەچی پەشیمان ببمەوە؟ وتی بە ڕەزامەندبونت لە دادوەری کردنی نێوان علی‌و معاویە (ڕەزای خوای لێبێت)، پێشەوا وتی: لەم بارەیەوە گفتوگۆم لەگەڵ ئەکەیت؟ وتی: بەڵێ، پێشەوا وتی: ئەگەر جیاوازی بیروڕامان هەبوو کێ لە نێوانمان بێت‌و دادوەرمان بێت؟ وتی: فلانە کەس، پێشەوا وتی: ئایا ڕازی ببیتە دادوەر لە نێوانمان؟ وتی: بەڵێ، پێشەواش بە ضحاکی وت: ئەوا ڕازی بووی بە دادوەری کردنەکە، ئینجا ضحاك وازی لێهێنا.

## بەلاو تاقیکردنەوەی دووەم:-

کۆمەڵێك لەڕێ دەرچووان (الخوارج) چوونە لای ئەبوحەنیفەو شیرەکانیان لە کالانیان هێنابووە دەرەوە، پاشان وتیان: لاشەی دوو مردووان لەبەر دەرگای مزگەوت دانراوە . یەکێکیان: لاشەی پیاوێکە هێندەی ئارەق خواردەوە تا زگی پڕبوو، ئینجا بەهۆیەوە کەوتە ئاوزینگ

دانو مرد، ئەویدیکەش هی ژنێکە زینای کردووە، دوای ئەوەی زانی زگی هەیە (واتە منداڵی لەنێو زگی دایـە) خـۆی کوشـت، ووتـی: ئایـا لـە چ نەتەوەیەکن؟ ئایا جولەکـەن ؟ ووتیـان: نـەخێر، ووتـی: گـاورن؟ ووتیـان: نەخێر، ووتی: ئاگر پەرستن؟ ووتیان: نەخێر، ووتی: ئایا لە چ نەتەوەیەکن؟ ووتیان: لەو نەتەوەن کە گەواهی ئەدەن هیچ پەرسـتراوێك نییـە جگـە لـە (الله)، محمدیش بەندەو نێـردراوی خوایـە. پێـشەوا ووتـی: لـەبارەی ئـەم گەواهی دانە پێم بڵێن ئایا باوەڕەکەیان سێ یەکـە یـان چـواریەکە یـاخود پێنج یەکە؟ ووتیان: باوەڕهێنانیان سێ یەكو چواریەكو پێنج یەکی نییە، ووتی؟ ئایا باوەڕەکەی چەندە؟ ووتیان: هەموو باوەڕەکەیە، واتە باوەڕێکی تەواوە، ووتی: کەوابوو مەبەستی پرسیارەکەتان چییە لـە کەسـانێك، کـە ئێوە دانتان ناوە بەوەی بڕوادارن؟ ووتیان: وازبێنە، ئایا ئەمانە لە خـەڵکی بەهەشتین یاخود خەڵکی جەهەننەمن؟ ووتی: ئەگەر ئێوە پشتم تێنەکـەن، ئەوا لەبارەی دوو نەفەرەکـە هـەمان ووتـەی پێغەمبـەر ئیـبراهیم (ﷺ) ئەڵێم کە لەبارەی گەلێك ووتویەتی کە تاوانەکەیان زۆر گەورەتر بـووە لـە هی ئەو دووانە: ﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ فَمَـن تَبِعَنِـي فَإِنَّـهُ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ (سورة ابـراهيم/٣٦) جـا ئـەوەی شوێنی من بکەوێتو بە گوێی من بکات، ئەوە بێگومـان لـە پـەیڕەوانی منە، ئەوەش لـێم یـاخی ببێـت، ئـەوە بێگومـان تـۆ زۆر لێخـۆش بـوو میهرەبانیت)) تەفسیری ئاسان.

هەمان ووتەی عیسی (سـەلامی خـوای لێبێـت) ئـەڵێم کـە لـەبارەی

گەلێك ووتویەتی تاوانەکەیان زۆر گەورەترە لەم دووانە:-

﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (سورة المائدة/ ١١٨) جا ئەگەر ئەشکەنجەیان بدەیت (لەسەر لادانو تاوانیان) ئەوە بە راستی بەندەی خۆتنو ئەگەر لێشیان خۆش بیت، ئەوە بە راستی تۆ خۆت خوایەکی بالاّ دەستو دانایت (دەزانیت کێ شایستەی لێخۆش بوونە)) تەفسیری ئاسان. هەمان ووتەی پێغەمبەر نوح (ﷺ) لەبارەی ئەم دووانەوە ئەڵێم، لەو کاتەی ووتیان: ﴿قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ۞ قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ۞ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَى رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ۞ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الشعراء/ ١١١-١١٤) (هەندێك لە دەمدارانی قەومەکەی) ووتیان: ئێمە چۆن باوەڕ لەبەر خاتری تۆ بهێنین، لە کاتێکدا کە کەسانی هەژارو داماو شوێنت کەوتوون۞ نوح ووتی: جا من چوزانم، ئەوان چ کارو کردەوەیەکیان ئەنجامدەدا (من بانگم کردن بۆ ئیمانو بڕوایان هێناوە)۞ حسابو پرسینەوەیان تەنها لەسەر پەروەردگاری منەو لەسەر کەسی تر نییە، ئەگەر هەستو هۆشیاریتان هەیە۞ من هەرگیز ئیمانداران دەرناکەمو (دڵیان ناتێشینم))) تەفسیری ئاسان) وە قسەی نوح (ﷺ) کە ووتی: ﴿وَلاَ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلاَ أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلاَ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ وَلاَ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِي أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ اللّهُ خَيْرًا اللّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِي أَنفُسِهِمْ إِنِّي إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ﴾(هود/ ٣١) هەروەها نالێم بەو ئیماندارانەی لەبەر چاوی ئێوە کەم نرخن، خوای گەورە هەرگیز خێریان بەسەردا نارژێنێت، خوا خۆی ئاگادارە بەوەی لە دەروونیاندا هەیە،

بێگومان من ئەو کاتە (ئەگەر وابکەم) لە ستەمکارانم)) - تەفسیری ئاسان).

خۆشەویستانم لەبەر خوا، تەماشای زیرەکی پێشەوا بکەن چۆن بوو؟ بەهۆی تێگەیشتنو لەبەرکردنی قورئانی پیرۆزو فێربوونی زانستەکان هەوڵی خۆ رزگارکردنیدا لەم بەڵایە، چونکە لەبەرکردنی قورئانو فێربوونی زانستەکانی ئایین مرۆڤ لەو بەڵایانەو تاقیکردنەوانە رزگار ئەکات کە بەسەری دێن، هەروەك ئەمە لەگەڵ پێشەوادا (رەحمەتی خوای لێبێت) روویدا.

خۆ ئەگەر هاتوو پێشەوا هەر لە سەرەتادا وەڵامی دابایەوە بەوەی کە هەردووکیان بڕوادارن نەیانکوشت، چونکە ئەوان باوەڕدار بەبێ باوەڕ دائەنێن بەهۆی گوناهو تاوانەکان .

## بەڵاو تاقیکردنەوەی سێیەم:-

لە ساڵی (١٣٠)ی کۆچیدا دووبارە پێشەوا تاقیکرایەوە، لەو کاتەشدا تەمەنی پەنجا ساڵ نەبوو، لێپرسراو، و والی شاری کوفەش لەو کاتەدا عمر کوڕی هبیرە بوو لە سەردەمی بەنی ئومەییەکاندا، بەڵاو ناخۆشی لە عێراقدا بەدەرکەوتو زۆربوو، زانایان لە ماڵی عمر کۆبوونەوە، لە ناویاندا ابن ابي ليلىو ابن شبرمەو داود بن ابي هندی تێدابوو، بەهەر یەکێك لەواندا ئیشێکی پێسپاردن پاشان بە دوای ئەبوحەنیفەی دا ناردو ئەیویست مۆرەکەی بداتە دەست، بەهۆیەوە هەموو نووسراوی فەرمانێکی

تازە دەرچوو، و راکێشانی هەرماڵێك یان دراوێك تەنها ئەکەوتە ژێر دەستی ئەبوحەنیفە، بەهۆی مۆرەکەوە (تەنها بە ئەبوحەنیفە جێبەجی ئەبوو) ئەبوحەنیفەش بەمە رازی نەبوو، ابن هبیرە سوێندی خوارد ئەگەر مۆرەکە وەرنەگرێت سزای بدات.. زانایانیش بە ئەبوحەنیفەیان ووت: سوێندت ئەدەین بە خوا کە خۆت بە هیلاك نەدەی، ئێمە برای تۆین، هەموومان ئەمەمان پێناخۆشە، رێچکەی دەربازبوونیش نابینین، ئەبوحەنیفەش ووتی: ئەگەر بیەوێت دەرگای مزگەوتی واسطی بۆ ئامادە بکەمو بکەمەوە ووتی: بۆی ناکەم، ئەوا چۆن داوا لە من ئەکات نووسراوی فەرمانێك مۆر بکەم کە تیایدا رژانی خوێنی مرۆڤێك بە رەوا دابنێت. پۆلیسی ئەو کاتیش ئەبوحەنیفەی لەسەر ئەم هەڵوێستەی بەند کردو سەد قامچیان لێدا، هەموو رۆژێك دە قامچی ئەدرا لە سەرو دەمو چاوو هەموو لاشەی، ئەبوحەنیفەش لە هەموو ئەمانەدا خۆڕاگرو بێ دەنگ بووو سکاڵای بارو دۆخی نەئەکرد، شوێنەواری لێدانەکە لەسەر دەمو چاوی مایەوەو دەرکەوت زۆر غەمبار بوو ئەترسا لەوەی دایکی ببینێو بەهۆیەوە ئازار بچێژێ. دوای ئەوەی دایکی ئەمەی بینی پێی ووت: ئەو زانستەی ئەمەی بەسەر تۆدا هێناوە باشتروایە وازی لێبهێنی، ئەویش بە دایکی ووت: ئەگەر زانستەکەم لە پێناو دونیادا بێت، ئەوا دونیام بەدەست ئەهێنا، بەڵام ویستم بزانی من زانستم لە پیس بوونو فەوتان پاراستووەو خۆم تووشی ئەزیەتو ئازار کردەوە.

خۆشەویستانم، پێشەوا بەم جۆرە بوو لە دونیادا سزای چەشتو بەڵام لە دوارۆژدا خۆی تووشی سزای ئاگری دۆزەخ نەکرد.

## ١٤- پێشەوا دیاری لە دەسەڵاتداران وەرناگرێت:-

مەنصور دە هەزار درهەم‌و کەنیزەیەکی گەنج ئەکاتە دیاری‌و بۆ ئەبو حەنیفەی ئەنێرێت. نیازو نیەتی مەنصور بۆ ناردنی دیاری خۆشەویستی‌و دڵسۆزی ئەبو بەرامبەر بە پێشەوا، بەڵکو تاقیکردنەوەی پێشەوا بوو لە رووی لایەنگرایەتی بۆ مەنصور. ئینجا ئەگەر پێشەوا دیاریەکەی وەرگرتبایە ئەوا دیارە لایەنگریەتی بەلاّم ئەگەر وەری نەگرتبایە ئەوا لاەیەنگری نییە.

لەو سەردەمیش وەزیرو راوێژکاری مەنصور پیاوێکی چاك‌و خاوەن رایەکی باش بوو سەبارەت بە ئەبو حەنیفە، ئەویش عبدالمالك کوڕی حمد بوو. راوێژکار چاکەی ئەبو حەنیفەی ئەویست‌و پێی ووت: سوێندت ئەدەم بە خوا، ئەمیری بڕواداران هۆیەکی بۆ بڕیاری وەرنەگرتنەکەی تۆ ئەوێت- داوای وەرگرتنی دیاریەکەی لێکرد- بەلاّم ئەبو حەنیفە پێگیر بوو لەسەر وەرنەگرتنی دیاریەکە.

ئیشەکە بەمەوە نەوەستا بەڵکو پێشەوا دیاری رووبەڕووی لە مەنصور وەرنەئەگرت، ئەمەش زیاتر لە چەندین جار بووە. ئینجا لە جارێکیان لە مەنصور پایەی دادوەری پێشکەش بە ئەبو حەنیفە کرد، تاوەکو ئەرکی دادوەری کردن بگرێتە ئەستۆ، بەلاّم پێشەوا داواکەی رەت کردەوە کە ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ، بۆیە مەنصور گومانی برد کە هۆکاری وەرنەگرتنەکە هۆیەکی رامیاری لەپشتە، بۆیە بە ئەبو حەنیفەی ووت: تۆ ئەگەر ئەرکی دادوەری کردن ناگریتە ئەستۆ، بۆ دیاریەکانم وەرناگری؟ ئەبو حەنیفەش وەلاّمی دایەوە کە پێویستە لەسەر هەموو زانایەك لەم

سەردەمەماندا، ئەم هەڵوێستەو وەڵامە لەبەر بکاتو ئیشی پێ بکات تاوەکو پلەو پایەو ڕێزی پێ گەورەو زۆر بێت چونکە ئەمە لە وێنەی وانەیەکە لە ئازایەتیو جوامێریو دەست پاکیو، شارەزاییە لە ئایین دا.

پێشەوا لە وەڵامی مەنصور دا ووتی: (( ئەی ئەمیری ئیمانداران هیچ ماڵێکی تایبەتی خۆت بۆ من بە دیاری نەناردوە تا لێتی وەرنەگرم خۆ ئەگەر هاتو دیاری تایبەتیت لە ماڵی خۆت بۆم بناردبایە ئەوا وەرم ئەگرت، بەڵکو دیاریەکانت لە ماڵی گشتی موسڵمانان (بیت مال المسلمین) بوو لەمەدا هیچ مافێکم بەم ماڵەوە نییەو تاوەکو وەری بگرم،وە جەنگاوەریش نیم تاوەکو وەك جەنگاوەرەکان بتوانم وەری بگرمو منالی ئەوانیش نیم تاوەکو وەك منالەکانیان ماڵی ئەوان بخۆمو هەژاریش نیم تاوەکو وەك هەژاران ماڵ وەرگرم)).

بەم هەڵوێستە جوانەو ئازایانە ئەبوحەنیفە دیارییەکان لە جێنیشینی (دەسەڵاتداری موسڵمانان) وەرناگرێت، بەشێوەیەکی دڵنیاکەرەوەی ئەوتۆ کە ئەمە دەستکاری کردنی موڵكو ماڵی جگە لە خۆیەتی، و ئەو موڵكو ماڵەش هی موسڵمانانەو مافی جێنشین نییە بیکاتە هی خۆیو دەستکاری بکاو بیکاتە دیاریو بیبەخشێتەوە.

جا مەنصور پلەیەکی گەورەتری پێسپارد ئەویش سەرۆکی دادوەران بوو، ئەبوحەنیفەش وەکو پێشوو ئەمەی وەرنەگرت بۆیە مەنصور فەرمانی بەندکردنی ئەبو حەنیفەی داو سەرەڕای تەمەن گەورەییو پیربوونی حەنیفە.

## ١٥- كۆچی دوایی پێشەوا:-

هەموو شتێك پێویستە سەرەتای هەبێتو بەهەمان شێوەش ئەبێت کۆتاییشی هەبێت، ئەگەر هاتوو بە ئەمری مابایەوە ئەبووایە گەورەی مرۆڤایەتی محمد (ﷺ) بووایە، بەلام لەم دونیایەدا هیچ کەس نامینێت تەنها خوای دروستکەرو بێهاوتا نەبێت.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ * وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ (الرحمن ٢٦،٢٧) هەموو ئەو کەسانەی لەسەر رووی زەوین، هەر هەمووی فەوتاو تیاچووەو دەبێت بمرن* تەنها زاتی پەروەردگاری خاوەن بلندیو رێزداری تۆیە کە دەمێنێتەوە)) - تەفسیری ئاسان).

پێشەوا (بەرمیهرەبانی فراوانی خوای گەورە بکەوێت)، لە ساڵ ی سەدو پەنجای کۆچیو سەردەمی جێنشینایەتی مەنصور کۆچی دوایی کرد، پێشەوا پێش مردنی وەسیەتی کرد لە زەوییەکی پاكو داگیرنەکراو، و دەست بەسەرا نەگیراودا بم نێژنو لە زەوییەك مەمنێژن کە گومانی ئەوە هەبێت ئەمیر دەستی بەسەردا گرتبێت، دوای ئەوەی ئەم وەسیەتە گەیشتە حعفر منصور، ئەوسا ترساو ووتی ((کێ هەیە داوای لێبووردنی من وەربگرێت لەجیاتی ئەبوحەنیفە چ لە حاڵی زیندوویی دابێت یاخود کۆچی دوایی کردبێت)).

حسن کوڕ ی عمارە ئەرکی لاشەی پێشەوای (رەحمەتی خوای لێبێت) گرتە ئەستۆ، پاشان مەدحی کردو ووتی: لاشەیەکی لاوازی هەبوو ئەویش بەهۆی ئەوەی پەرستشەکان لاشەکەی لاواز کردبوو، خەڵکێکی زۆریش

ئامادەی ناشتنی تەرمەکەی بوون، گوتراوە: پەنجا هەزار کەس نوێژی لەسەر کردووە، و لە ناویاندا ئەبوجعفری منصور هەبوو کە ئازاریشی دابوو.

پێشەوا رەحمەتی خوای لێبێت، لە تەنیشتی (رۆژهەلاّتی) بەغداو لە گۆڕستانی (الخیزران) بە خاك سپێردراوە، گۆڕەکەی دیارو ناسراوە. خەڵکێکی زۆریش بەهۆی کۆچی دواییەکەی پەرێشانو غەمبار بوون.

دوای ئەوەی هەواڵی کۆچی دوایی کردنی ئەبوحەنیفە گەیشتە ابن جریح، گەڕایەوەو پێیدا هەڵگوت‌و، ووتی: چ زانستێك لە نێوانماندا رۆیشت.

## ١٦- ئەو قسانەی پاش کۆچی دواییەکەی لەبارەیەوە ووتراون:-

ئەگەر مرۆڤ لەکاتی ژیانو لەنێو خەڵکیدا خاوەنی ئاکارو ناوبانگی باشی هەبوویێت، ئەوا ئەم ناوبانگەی ئەمێنێتەوە تا دوای مردنیش، خۆ ئەگەر خاوەنی ناوبانگێکی بەدو خراپ بێت ئەوا ئەم ناوبانگ خراپەی تا دوای مردنیش ئەمێنێتەوە. ئا ئەمەیە پێشەوا ئەبوحەنیفە رەحمەتی خوای لێبێت، خاوەنی رەوشتی چاك‌و ناوبانگی باش‌و گەورە بووە ، بۆیە ئەو ئەمرێت‌و ناوبانگە باش‌و چاکەکەی بە درێژایی کات‌و سەردەمەکان هەر ئەمێنێتەوە.

لەمەودوا ووتەی هەندێك لە زانایان، کە دوای کۆچی دواییەکەی ووتویانە، باس ئەکەین:

## ١- ووتەی فضیل کوڕی عیاض:

ئەبوحەنیفە پیاوێکی شارەزاو ناسراو بوو لە شەریعەتدا، و دەوڵەمەند بوو، ناسراوبوو بە چاکەکار بۆ هەموو ئەوانەی سەردانیان ئەکرد، بە ئارامو خۆڕاگربوو لە فێربوونی زانست چ شەو بووایە یاخود ڕۆژ بووایە، (وە شەو نوێژ ی زۆری ئەکرد)، زۆر بێدەنگ بوو، کەم قسەی ئەکرد تا لەبارەی حەڵاڵ یان حەرام پرسیاریان لێنەکرد قسەی نەئەکرد، حەزی لە دۆزینەوەی ڕاستی بوو، لە پارەوپولی دەسەڵاتداران ڕای ئەکردو وەری نەئەگرت.

## ٢- ووتەی ملیح کوڕی وکیع:

سوێند بە خوا ئەبوحەنیفە ئەمانەتو سپاردەی لا گەورەبوو، سوێند بە خوا پیاوێکی بەڕێزو گەورەبوو، ڕەزامەندبوونی خوای گەورەی لە پێش هەموو شتێکەوە دانابوو، ئەگەر لە پێناو خوادا تووشی مەترسی مردن بووایە ئەوا بەرگەی ئەگرت، خوایە وەکو چۆن لە چاکەکاران ڕازی بووی وەهاش لە ئەو ڕازی ببە. لە چاکەکارانیش بوو.

## ٣-ووتەی فەرمووده‌ناس ابن جریج:

لەبارەی ئەبوحەنیفەوە کاتێك هێشتا هەر لە سەرەتای ژیان دابوو ووتی: ئەبێتە زانایەکی گەورە، دوای ئەوەی کە گەورەبوو، ووتی: بەراستی شارەزایە بەراستی شارەزایە لە ئاییندا!! دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد، ووتی: چ زانستێکی زۆر لە نێوانماندا ڕۆیشت.

### ٤- ووتەی حفص کوڕی غیاث:

ئەبوحەنیفەم لە خەودا بینی‌و پێم ووت: ئەی ئەبوحەنیفە خوای گەورە چی لێکردی؟ ووتی: لێم خۆشبوو، ووتم: چ بیرو ڕایەکت پێ باشە؟ ووتی: بیرو ڕای عبداللەی کوڕی مسعود زۆر باشە.

### ٥- ووتەی شعبە:

دوای ئەوەی هەواڵی کۆچی دوایی پێشەوا (ڕەحمەتی خوای لێبێت) گەیشت بە (شعبە) ووتی: ڕووناکی زانست لە شاری کوفە کوژایەوە، هەرگیز وێنەی ئەو نابیننەوە.

## ١٧- لە ووتەکانی پێشەوا:

١- هەر کەسێك زانستەکەی قەدەغەو ڕێگری نەکات لە بێ فەرمانی‌و (لەڕێ دەرچوون) لە فەرمانەکانی خوای گەورە، ئەوا لە زەرەرمەندانە.

٢- ئەگەر شارەزایان (الفقها و)و زانایانی ئایینی دۆستانی (اولیاء)ی خوای گەورە نەبن، لە دونیاو دوارۆژدا، ئەوا خوای گەورە دۆستی نییە.

٣- غەزا کردنێك دوای ئەنجامدانی فەرزی حەج باشترە لە ئەنجامدانی پەنجا حەجی سوننەت.

٤- هەر کەسێك داوای سەرۆکایەتی بکات بۆ ئەوەی شایانی بێت ئەوا هەردەم سەرشۆڕە.

٥- هەر کەسێك بۆ دونیا زانست فێر ببێت ئەوا لە بەرەکەتی زانستەکە بێبەش ئەبێت‌و خەڵکیش سوودی لێنابینن، و هەر کەسێکیش لەبەر ئاین فێری زانست بێت بەرەکەت ئەکەوێتە ناو زانستەکەی‌و لەنێو دڵیدا جێگیر ئەبێت، خەڵکانی زۆریش سوود لە زانستەکەی وەرئەگرن.

٦- گەورەترین گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورە، بڕوا هێنانە بەخوا، و گەورەترین تاوانیش بێباوەڕییە بەخوای گەورە، جا هەر کەسێك شوێن فەرمانی خوای گەورە بکەوێت لە گەورەترین گوێڕایەڵیەکان‌و خۆی بپارێزێت لە گەورەترین تاوانەکان، تکاوایە خوای گەورە لێی خۆش بێت.

٧- نموونەی کەسێك بە دوای فەرمووددا ئەگەڕێت‌و لێی تێناگات ، وەکو کەسێکی دەرمان کۆکەرەوە وایەو دەرمان کۆئەکاتەوە نازانێت ئەم دەرمانانە بۆ چ نەخۆشێك بەکاردێن تاوەکو دکتۆر دێت، بەم جۆرە خوێنەری فەرموودە بە تەواوی لە فەرموودە ناگات تاوەکو شارەزای ئاین (الفقیه) دێت‌و پێی ئەڵێت.

٨- هەر کەسێك لەبارەی زانستێکەوە قسە بکات‌و بڕیار بدات‌و گومانی وابێت خوای گەورە پرسیاری ئەوەی لێناکات: کە چۆن بڕیارو فەتوای داوە لە ئایینی خوای گەورە؟ ئەوا ئایینی لەسەرەخۆ ئاسان کردووە.

٩- هەر کەسێك ڕێز لە خۆی بگرێت دونیاو ناخۆشیەکانی ناوی لەسەر سوك‌و ئاسان ئەبن، و هەر کەسێکیش بیەوێت لە سزای دواڕۆژ ڕزگاری ببێت، ئەوا گرنگی زۆر بە سزای دونیا نادات.

## ١٨- پەندو ئامۆژگاری لە ژیانی پێشەوادا:

١- هەژاری شورەیی نییە بەڵکو نەزانی عەیبو شورەییە.

٢- زانست خاوەنەکەی بۆ بەرزترین پلەی دونیاو دوارۆژ بەرز ئەکاتەوە.

٣- خوێندن لەسەر هەموو موسڵمانێکی نێرو مێ واجبە.

٤- موسڵمان لەبارەی هەموو شتێك هەندێکی لێ ئەزانێتو هەوڵی ئەوە نادات لە هەموو شتێکدا هەمووی بزانێت.

٥- تایبەتمەندبوونو ڕۆچوون لە بوارێك لە بوارەکانی زانستەکانو شارەزاییەکی تەواو لێی، باشترە لەوەی مرۆڤ ڕاڕابێت لە نێوان زانستەکاندا.

٦- موسڵمان بەرگەی تەنگو چەڵەمەو ناخۆشی سەر ڕێگای فێربوونو شارەزابوونی زانست ئەگرێت.

٧- موسڵمان هەرگیز بێ هیوا نابێت لە فێربوونی زانستو بەردەوام لە خوا ئەپاڕێتەوەو ئەڵێت ((وقل رب زدني علما/ ئزا بکەو بڵێ: پەروەردگارا، بەردەوام زانستو زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە)) (طە، ١١٤- تەفسیری ئاسان).

٨- موسڵمان فێری زانستی بەسوود ئەبێت تاوەکو سوودو قازانج بە خۆیی و موسڵمانان بگەیەنێت.

٩- موسڵمان دوور ئەکەوێتەوە لەو زانستە زیانبەخشەی سوود بە خەڵکی ناگەیەنن وەکو پیشەسازی ئارەق و ماددە بێهۆشکەرەکانو هەموو ئەوانەی کە زیان بە خەڵکی ئەگەیەنن.

١٠- ئەگەر هاتوو مرۆڤی زانا کۆچی دوایی کرد، ئەوا ژیاننامەکەی بەهۆی زانستەکەیەوە سوود بە خەڵکی ئەگەیەنێت.

١١- موسڵمان هەمیشە دامەزراوەو ئەو بەڵاو ناخۆشیانەی لە دونیادا بەسەری دێن هیچ کاری تێناکات، چونکە ئارام گرتن لەسەر بەڵاو ناخۆشیەکانو بەرگە گرتنی ئازارەکان لە ڕەوشتی موسڵمانەکانە.

١٢- دیاری وەرگرتن ئەگەر مەبەست لە بەخشینی دیارییەکە بەرژەوەندییەکی لە دواوە هەبێتو بەهۆیەوە خوای گەورەی لێ بتۆرێت ئەوا هەرگیز دیاریەکە وەرناگرێت با هەرچەندە بە مشار بیکەنە دوو پارچە.

١٣- هەر کەسێك لەبەر خوای گەورە واز لە شتێکی حەرام بهێنێت ئەوا خوای گەورە شتی حەڵاڵی باشتری پێئەدات لە شتە حەرامەکە.

١٤- گۆشتی زانایان ژەهراویەو هەر کەسێك ئازاریان بدات ئەوا سزای خوای گەورە بۆ خۆی مسۆگەر ئەکات.

١٥- باش وایە تەرمی مردوو لە شوێنی پاكو دوور لە تاوانکردن تیایدا بنێژرێت.

## ١- ناو، بنەماڵە، لە دایك بوونی:-

نازناوی ئەبو عەبداللەیەو ناوی تەواوی محمد کوڕی ئیدریس کوڕی عباس کوڕی عثمان کوڕی شافع کوڕی سائب کوڕی عبید کوڕی عبد یزید کوڕی هاشم کوڕی عبدالمطلب کوڕی عبدمناف قورەیشی (مطلبی) هاشمی، مەکەییە.

شافعی نەوەی دوو هاشمیانە: هاشم کوڕی عبدالمطلبو هاشم کوڕی عبدمناف، چونکە ئەوەی دیکە هاوسەرداری پێك هێنا لەگەڵ شفاء کچی هاشم کوڕی عبد مناف، لەوانەش عبدیزیدی باپیری شافعی لە دایك بوو.

پێشەوا شافعی لە رووی مێژووی لە دایك بوونیەوە سێیەم پێشەوایە لە چوار پێشەوایە کە، تازەکەرەوەی ئایین بوو لە سەدەی دووەم دا، پێشەوا شافعی (رەزای خوای لێبێت) لە (غەزەی ) ولاتی فلسطین لە ساڵی (١٥٠)ی کۆچی لە بنەماڵەیەکی هەژار لەدایك بووەو هەر بە هەژاریش پێگەیشتو زانستی خوێندوە. بە شێوەیەك لەکاتی خوێندنی پارچە خەزەف- قوری سورکراو-و پارچەی پێستی پاك کراو، توێکڵی دارخورما، ئێسکی مامزی کۆنەکردەوە تاوەکو ئەوەی خوێندویەتی لەسەری بنوسێتەوە هەروەها ئەچوە فەرمانگەی تۆمارکردن تا لەوێ کاغەزی زیادە کۆبکاتەوە بۆ نوسین. دایكو باوکی لەشاری مەککەوە بەرەو غەززەو عەسقەلان کۆچیان کردبوو تاوەکو بژێوی ژیانیان مسۆگەر بکەن، بەڵام دوای ئەوەی شافعی لەدایك ئەبێت بەماوەیەکی کورت باوکی کۆچی دوایی ئەکات محمد (شافعی) هێتیم کەوت، چارەنوسی کەوتە دەست دایکی،

ئینجا ئەگەر دایکی ژنێکی ژیرو چاك بێت ئـەوا هۆکـاری خۆشـبەختیو کامەرانی بۆ منالّەکەی مسۆگەر ئەکات، بەلاّم ئەگەر وەهـا نـەبوو ئـەوە منالّەکەی توشی خراپـەو داهاتویـەکی نارۆشـن ئـەکات. لەبـەر بـەختی پێشەوا شافعی دایکی یەکێك بوو لە دایکە ژیرو تێکۆشەرە باشەکان.

بەلّگەش بۆ ئەمە، جارێکیان دایکی شافعیو ژنێکی دیکـەو پیاوێـك بۆ گەواهی دان بانگ ئەکرێنە لای دادوەر.

جا لەو کاتەدا، دادوەر ئەیەوێت هەردوو ژنەکان لەیـەك جیابکاتـەوەو بەجیاو یەکە بەیەکە گەواهییەکەیان لێ وەربگرێت، بۆیە دایکـی شـافعی بە دادوەر ئەلّێت: بەم شێوەیە نابێت چـونکە خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ((ان تضل احدهما فتذكر أحدهما الاخرى/ ئەوەکو یەکێك لـە ئافرەتـەکان بیری بچێت، با ئەوی تریان بیری بهێنێتەوە)) (البقرە، ٢٨٢-ت-ئاسان).

ئینجـا دادوەریـش لەسـەر رای دایکـی رازی بـوو، ئەمەشـی بـە هەلّێنجانێکی بەهێز داناو بەبەلّگەشـی دانـا لەسـەر زانـاییو شـارەزایی هەبوونی بە قورئانی پیرۆز، زانستەکەشی هۆکارێك بوو لە پەروەردەکردنی منالّەکەی بـە پەروەردەیـەکی تەندروسـتو رێـكو پێـك، کـە بەهۆیـەوە (محمد)ی کوڕی بووە پێشەوایەکی بەرچاوی گەلی موسلّمان.

## ٢- پێگەیشتنی زانستی:

فاتمە خانم کچی عبدالله (ازدی) کوڕەکەی خۆی خـستە بـەر خوێنـدن تاوەکو قورئان لەبەر بکات، سەرەرای ئەوەی هەژارو هەتیمو بێ باوك بوو، شافعی لەتەمەنی منالّیـدا چـووە قوتابخانـەو دایکـی هیـچی نـەبوو تـا

لەجیاتی کرێی خوێندن بیداتە مامۆستاکەی، بۆیە مامۆستاکەی کەمتەرخەمی نەکرد لە فێرکردنی شافعیدا، بەڵام لەبەر ئەوەی منداڵەکە زۆر زۆر زیرەك بوو سەرنجی مامۆستاکەی بۆ لای خۆی راکێشا، چونکە پێشەوا شافعی زوو وانەکانی لەبەر ئەکرد بۆیە مامۆستاکەی بایەخ و گرنگی تەواوی پێدا، بێ ئەوەی کرێی خوێندنی لێوەربگرێت. ئینجا پێشەوا شافعی قورئانی پیرۆزو (الموطأ)ی لەبەر کرد لەکاتێکدا هێشتا منداڵێکی دە ساڵان بوو...پاشان گرنگی بەزمانی عەرەبی داو، لەم پێناوەشدا چووە دەشت و (دە) ساڵان لەگەڵ هۆزی ((هذیل)) ژیانی بردەسەر تاوەکو لێیانەوە فێری قسەکردن بێت. هۆزی هذیل رەوانترین هۆزی عەرەب بوون، پێشەوا شافعی شیعرو رووداوەکانی رابردووو چیرۆکەکانی ئەم هۆزەی لەبەرکرد.

سەرەڕای خوێندنەکەی فێری تیر هاوێشتن بوو، بەشێوەیەك (دە) تیری ئەهاوێشت، لە هیچیاندا هەڵەی نەئەکردو لەهەموویان نیشانەکەی ئەپێکا.

پاشان گرنگی بەفێربوونی شەریعەت (الفقه)دا هەتا بووە زانایەکی دیارو بەرچاو لەناو گەلی موسڵماندا، لەهۆی ئەم گرینگی دانەش چوار گێڕانەوە هەن:

گێڕانەوەی یەکەم: رۆژێکیان لەسەر وڵاغەکەی بوو، لە دواوەشی نوسەری (عبدالله زبیر) دانیشتبو، بەرێدا ئەرۆیشتن، پێشەوا تازە پێئەگەیشت و نەوجەوان بوو، ئینجا شیعری شاعیرێك ئەخوێنێتەوە،

نوسەرەکەشی قامچیەکی بەشێوەی ئامۆژگاری لێئەداو پێی ئەڵێت: کەسانی وەکو تۆ خۆیان کەمو لە کەدار ناکەن، ئایا تا چ ئەندازەیەك شارەزاییت هەیە لەبارەی شەرعەوە؟ بۆیە ووتەکەی کاریگەری لەسەر دڵی ئەبێتو خێرا ئەکات لەوەی بەشداری کوڕی زانستی مسلم کوڕی خالد زنجی، موفتی شاری مەککە ئەکاتو لێیەوە فێری شەرع ئەبێت.

گێڕانەوەی دووەم: لە ڕێگادا بوو (ئەچوو فێری ڕێزمانی عەرەبیو ویژە بێت) گەیشت بە (مسلم)ی زاناو شارەزا لە ئایین، ئینجا (مسلم) بە شافعی ئەڵێت: خەڵکی کوێیت؟ ووتی: خەڵکی (مەککە)م، ووتی: ماڵت لە کوێیە؟ ووتی: لە (شعب الخيف)ە- ناوچەیەکە لە مەککە... ووتی: لە چ هۆزێکی؟ شافعی وەڵامی دایەوە: لە هۆزی عبد مناف. مسلم ووتی: بەهـ بەهـ!! (بۆ سەرسوڕمان بەکاردێت) خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژدا ڕێزی لێگرتووی، ئایا ووزەو تێگەیشتنەکەت لە زانستی شەرعدا خەرج کردبایە باشتر نەبوو بۆ تۆ؟

گێڕانەوەی سێیەم: شافعی خەریکی شعر فێربوون بوو... کە گەیشتە (مونا) دەنگێك لە دواوەی شافعی پیێ ی ووت: خەریکی فێربوونی شەریعەت بەو ووزەو تواناى خۆت لە فێربوونیدا خەرج بکە. بەڵام گومانی زیاتر لەبارەی ئەم گێڕانەوە ئەوەیە، ئەمە زیاتر لە ئەندێشە نزیکترە تاوەکو لە ڕاستیو واقع بێت.

گێڕانەوەی چوارەم: جارێکیان مصعب کوڕی زبیر ئەگاتە شافعی (لەو کاتەدا خەریکی فێربوونی شعرو ڕێزمانی عەرەبی ئەبێت) مصعب پیێ ی ئەڵێت: تاکەی خەریکی ئەمە ئەبیت؟ ئەگەر بهاتایە فێری فەرموودەو

شەرع بووتایە بۆ تۆ باشتر بوو، ئینجا لەگەڵ مصعب چووە خزمەت پێشەوا مالیك کوڕ ی ئەنەس‌و بە ئەوی سپارد، لە خزمەت پێشەوا مالیك مایەوە تاوەکو زۆربەی زانستەکەی لەلا خوێند، بە هەمان شێوە چووە لای زانایانی دیکەی شاری مەدینەو زانستی ئەوانیشی خوێندو پاشان چووە عێراق لەوێ لای محمد کوڕی حسن مایەوەو لێیەوە فێری زانستی شەریعەت بوو، پاشان گەڕایەوە شاری مەدینە.

گێڕانەوەو رووداوەکان هەر چۆنێك بێت ئەنجام ئەوەبوو خوای گەورە پێشەوا شافعی نامادەکردبوو لەوەی فێری شەریعەت بێت نەوەك زمان‌و وێژە فێر ببێت، چونکە لە دڵی چەسپاند بوو کە زانستی شەریعەت باشترە لە زمان‌و وێژەی عەرەب.

بەم جۆرە پێشەوا شافعی بەردەوام بوو لە نامادەبوونی کۆڕی زانایان لە بوارە جیاجیاکانی زانستەکاندا، لەبەر زۆری هەژاریەکەشی ئەو ئێسکانەی کۆنەکردەوە کە ئەتوانرا لەسەری بنوسرێت، تاوەکو ئەو زانستەی لەلای زانایان خوێندوویەتی لەسەری بنووسێتەوە، هەمووجار ئەچووە خانەی تۆمارکردن (ی سەر بە حکومەت)و پارچە پەڕاوی فرێدراوی کۆنەکردەوە تاوەکو لەسەریان بنوسێت‌و ئەیووت:

زانست نێچیرە، و نووسین بەستنەوەیەتی
بە پەتێکی بەهێز نێچیرەکەت ببەستەوە
چونکە کەم ژیرییە مامز راوبکەی
و لەنێو خەڵکیشدا بەرهەڵدای بکەی

رۆژێکیان سندوقی پێشەوا شافعی شوێنی نامێنێت لەوەی پارچە ئێسكو پەڕاوو پارچە پێستی نووسراوی لێ دابنێت، هەتا شوێنی پشوودانو شوێنی نووستنەکەشی هەموو گرتبووەوە هیچ شوێنێك نەمابوو ئەمانەی لێ دابنێ بۆیە (ویستی) هاتە سەر ئەوەی هەرچی زانستە، ئەوەی لە پارچە ئێسكو پەڕاو، پارچەکانی دیکەدا کۆی کردۆتەوە بەباشی لەبەریان بکاتو پێویستی بەم هەموو پارچە کۆکراوانە نەبێت، و خۆیانی رزگار بکات

پێشەوا شافعی بەئەندازەیەك زیرەكو بیر تیژ بوو، کە، ئەگەر ویستبای بەشێك لە پەرتوکێك لەبەر بکات هەوڵی ئەدا لاپەڕەی بەرامبەر دابپۆشێت لە ترسی ئەوەی نەوەك چاوی پێ بکەوێتو لەبەری بکات پێش ئەوەی لاپەڕەی مەبەستدار لەبەر بکات.

هۆکاری بەهێزبوونی یادەوەریەکەشی بەهێزی باوەڕو یەقینو بڕوایەکی چاكو راستگۆییەکی بێ وێنە بوو.

سەرەڕای بەهێزی زیرەکیو توانای لەبەرکردنەکەی، ئەوە هەیە هەندێك سکاڵای خراپی توانای لەبەرکردنی زانستەکان لای مامۆستاکان ئەکاتو خۆی بە کەمتەرخەم دائەنێتو ئەڵێت:

سکاڵای خراپ لەبەرکردنم کرد بۆ لای وەکیع<br>ئەویش رێنمونی کردم بۆ وازهێنان لە گوناهـ<br>پێی ووتم زانست رووناکییە<br>وە رووناکی خواش نادرێتە گوناهکار

## ٣- گەشتە زانستیەکانی:

پێشەوا حەزی بە گەشت کردن هەبوو، حەزی ئەکرد لە پێناو فێربوونو زانستدا لە وڵاتێکەوە بەرەو وڵاتێکی دیکە بڕوات، تاوەکو فێری زانستی ئاین بێتو گوێ لە شاعیرانو وێژەوانان بگرێتو بارودۆخی موسڵمانانیش ببینێت...

ئێمە ئێستا باسی گەشت کردنەکانی پێشەوا شافعی ئەکەینو لە باسی ئەم گەشتانەشدا ئازارو ناخۆشیەکانی پێشەوا (شافعی)مان بۆ روون ئەبێتەوە کە لە ژیانیدا چەشتویەتی تاوەکو بوە یەکێك لەو پێشەوا بێ هاوتایانەی وەکو نموونە لە هەموو کاتو شوێنێکدا بۆ چاو لێکردن ئەهێنرێتەوە.

## ٤-گەشتی یەکەم بەرەو شاری مەدینە:

پێشەوا شافعی بەردەوام حەزی لە بینینی شاری مەدینە بوو، ئەو شارەی شوێنی سەرەتای بەهێزبوونو بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام بووە دڵی بە ئاوات بوو لەوەی سەردانی گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، هەروەها سەردانی (بەقیع)یش بکات، پاشان بچێتە خزمەت پێشەوا مالیكو لە بواری شەریعەتدا سوودی لێوەربگرێت.

دوای ئەوەی قورئانی پیرۆزو (الموطأ) ئەو پەرتوکەی فەرموودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) تیایدا کۆکراوەتەوە لەبەر بکات، ئەندازەیەکی باشیش

فێرببێت لە زانستی زمانو وێژەو شعرو ڕەوانبێژیدا، ویستی گەشت بکات بەرەو شاری مەدینە تاوەکو زانستی ئەوێش فێرببێت. ئینجا سەردانی دەسەڵاتداری مەککەی کرد تاوەکو لە ڕێگەیەوە بە خزمەت پێشەوا مالیك بگات‌و لەلای ئەو بخوێنێت.

دەسەڵاتداری مەککەش پێشەوا شافعی باش ئەناسیو لەبەر زانایەکەشی زۆری خۆش ئەویست بۆیە دوو نامەی بۆ نووسی: یەکەمیان بۆ دەسەڵاتداری مەدینە بوو، تیایدا پلەو پایەی زانستی شافعی روونکردەوە، دووەمینیش بۆ پێشەوا مالیك بوو تیایدا ئەو ڕۆڵە گەورەی پێشەوا شافعی پێی هەڵئەستێت (لەگەڵ خەڵکی مەککەو جگە لەوانیش لە بواری کاروباری ئاییندا) باس کردبوو.

پێشەوا شافعی هەردوو نامەکەی وەرگرت، بە دڵخۆشیەکی زۆرەوە گەڕایەوە ماڵەکەی، بەشێوەیەك بوو کە گەیشتە ماڵەوە لە خۆشیان بە توندی لە دەرگای ماڵەوەی دا، دایکیشی پێی ووت: ئەوە کێیە لە دەرگا ئەدات؟ ووتی: منم شافعی.

دایکی پێی ووت: بگەڕێوە، بڕۆ فێرە هەڵسوکەوتی جوانو باش بە، ئینجا وەرەوە. دەرگای لێنەکردەوە، بۆیە شافعی بەردەوام بوو داوای لە دایکی ئەکرد کە دەرگای لێبکاتەوەو داوای لێبوردنی لێئەکردو پێی ووت: هەرگیز جارێکی دیکە بەم شێوەیە لە دەرگا نادەم بەردەوام بوو لە پاڕانەوەکەی تاوەکو دایکی دەرگاکەی لێکردەوە، ئینجا شافعی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە.

پاشان بەرەو شاری مەدینە گەشتی کرد، کە گەیشتە ئەوێ چووە مزگەوتو نوێژی عەسری ئەنجامداو پاشان سەردانی گۆڕی پێغەمبەر (ﷺ)و دوو هاوڕێیەکەی کردو سەلامی لێکردن، پاشانیش سەردانی (بەقیع)ی کرد، ئینجا چووە لای دەسەڵاتداری مەدینەو خۆی پێناساندو دەسەڵاتداری مەدینەش شافعی بە پێشەوا مالیك ناساند.

دوای ئەوەی پێشەوا مالیك زانی شافعی پلەو پایەیەکی زانستی بەرزی هەیە، زۆری بەخێر هێناو کردیە میوانی ماڵی خۆیو پێی ووت: بەیانی پەرتوکی (الموطأ)ت بۆ ئەخوێنمەوەو فێرت ئەکەم. پێشەوا شافعی پێی ووت: لەبەرم کردووە، بۆیە پێشەوا مالیك داوای لێکرد (الموطأ) بخوێنێتەوە. ئینجا پێشەوا شافعی بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی (الموطأ) بۆ پێشەوا مالیك هەتاوەکو لە ماوەی چەند رۆژێکی کەمدا تەواوی کرد. بۆیە پێشەوا مالیك لەم زیرەکییەی پێشەوا شافعی زۆر دڵخۆش بوو. ئینجا شافعی لەمزگەوت و لە خزمەت پێشەوا مالیك دەستی بە وانە خوێندن کردو بەردەوام بوو لەسەری بەبێ دواکەوتنو بە رێكوپێكیش ئامادەی وانەکان ئەبوو . هەر وانەیەکیشی لای پێشەوا بخوێندبایە ئەوا ئەینووسییەوە. پێشەوا (مالیك)یش سەرنجی ئەدایەو زۆری پێ گرنگ بوو.

پێشەوا شافعی هەژدە مانگ بە میوانی لای پێشەوا مالیك مایەوە، وبەردەوام لەگەڵی بو ج لەماڵەوە یاخود لەمزگەوت دا. پێشەوا مالیك بە خۆی خواردنو خواردنەوەی پێشکەش ئەکرد. لەگەڵ خۆی ئەبرد بۆ نێو کۆڕی زانستییەکەی کە لەنێو مزگەوت بوو. دوای ئەوەی پێشەوا مالك

پەرتوکی (الموطأ)ی بـۆ فێرخـوازان ئەخوێنـدەوە ئـەوا شـافعی یارمـەتی فێرخوازانی ئەدا لە نووسینەوەی (الموطأ)و پێی ئەووتنەوە تاوەکو ئەوانیش ئەیانووسییەوە تا وای لێهات خەڵك پێـشەوا (شـافع)یـان ناسـیو رێـزی شایستەی ئەویان زانیو پلەو پایەی لای ئەوان بـەرز بـووەوە. بـەم جـۆرە شافعی زانستی (شەرع) لە پێشەوا مالیـك فێربـوو، یـادەوەری خـۆی بـە زانستی زیاتر بەهێزکردو فەرموودەشی لەلا خوێند. ئینجا شـافعی چـووە خزمەت مامۆستاو زانایەکانی دیکەی شاری مەدینەو لـەلای هـەموویان زانستی خوێند.

## ئەو شتە سەیرانەی شافعی لە (مەدینە)دا بینی:

بێگومان هەر مرۆڤێك بچێتە هەر شـوێنێك دوای شـوێنی لـە دایـك بوونیو تیایدا بژیو لەگەڵ بارودۆخەکەی رابێت، ئەوا لە شوێنە تازەکـەی هەندێك شتی سەیرو سەمەرە ئەبینێت. ئینجا پێشەوا شافعی چوار شـتی سەیری لە شاری مەدینەدا بینی:

یەکەم: داپیرەیەکی لەوێ بینی تەمەنی بیستو یەك ساڵ بوو.

دووەم: پیاوێکی زۆر قەرزاری بینی کە دادوەر لەبـەر قـەرزی خـەڵك بـەلای کـابراوە، بریـاری بێبـەش بـوونی لـەماڵی کابرایەکـە (واتـە قەرزارەکە)دا.

سێیەم: پیاوێکی پیری (نـەوەد) سـاڵەی بینـی بـەرۆژ بـەپێی پـەتی ئەسوڕایەوە خەڵکی فێری گۆرانی ئەکرد، کـاتێکیش، کاتـی نوێـژ کـردن

نەهات ئەوا بەدانیشتنەوە نوێژی ئەنجام ئەدا.

چوارەم: دەسەڵاتداری شاری مەدینەی بینی- پیاوێکی باش بوو- دەسەڵاتدارەکە ووتیە بەردەستەکانی خۆی: ئایا بۆچی خەڵك کۆنابنەوە لەبەردەم دەرگاکەمدا هەروەکو لەلای دەسەڵاتدارانی تر کۆنەبنەوە؟ ئەوانیش پێیان ووت: تۆ لەکەس نادەیو کەسیش ئازار نادەی. ئەویش ووتی: ئایا بەمجۆرەیە؟! دەی بڕۆن پێشەوام بۆ بێنن. ئەوانیش چوون گرتیانو هێنایان، ئینجا بەستیانەوە. لێیان ئەدا، پێشەواش ئەیوت: خوایە پایەدارت بکات لەسەر چ سزام ئەدەی؟!... ئەمە بەردەوام بوو تاوەکو خەڵك لێیان کۆبونەوە.

## ٥- گەشتی دووەمی بۆ عێراق:

شافعی دوای ئەوەی لەشاری مەدینە ئەو زانستانەی ویستی فێری بوو، خۆی ئامادەکرد بچێت بۆ عێراق بۆ ئەوەی لەوێ بخوێنێت، چونکە زانیبوی پێشەوا ئەبو حەنیفە لە عێراق ژیاوەو هەرلەوێش کۆچی دوایی کردوە، چەندین زانای لەدوای خۆی بەجێهێشتون، لەوانە ئەو دوو پێشەوایە پایە بەرزە: ئەوانیش: ئەبو یوسف کوڕی حسن بوو، دوای ئەوەی خۆی ئامادەکرد بۆ گەشت کردن، چووە خزمەت پێشەوا مالیكو پێی ڕاگەیاند ئەیەوێت بچێت بۆ عێراق. پێشەوا مالیکیش پێی ووت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((فریشتەکان باڵی خۆیان بۆ خێرخوازان ڕائەخەنو ڕازیشن لەسەر ئەوەی بۆی هەوڵ ئەدەن)). دوای ماڵئاوایی کردن پێشەوا شافعی

بەرەو شاری کوفە بەڕێ کەوت، کە گەیشتە ئەوێ چووە مزگەوت بۆ نوێژ کردن، لەوکاتەدا لەنێو مزگەوت کوڕێکی بینی نوێژی ئەکرد، شێوازی نوێژکردنەکەی پێ باش نەبوو، بۆیە ئامۆژگاری کرد بەڵام کوڕەکە ئامۆژگاریەکەی وەرنەگرت.

پاشان کوڕەکە چووە خزمەت ئەبو یوسفو ئیبن حسن. ئەوانیش لەبارەی نوێژەکەی پرسیاریان لێکرد. کوڕەکە بە هەردووکیانی ووت: پیاوێك لەنێو مزگەوت دایە رەخنە لەشێوازی ئەنجام دانی نوێژەکەم ئەگرێت. (کوڕی حسن) پێی ووت: بڕۆ لای پیاوەکەو پێی بڵێ: بە چ کردارێك دەست بە ئەنجامدانی نوێژ ئەکەی؟ کوڕەکە چووە لای شافعیو ئەم پرسیارەی لێکرد، وەڵامی (شافعی)ش ئەوەبوو: بە ئەنجامدانی دوو فەرزو سوننەتێك دەست بە نوێژ ئەکەم. (کوڕی حسن)یش بە کوڕەکەی ووت: بگەڕێرەرە لای ئەو، پرسیاری دوو فەرزو سوننەتەکەی لێبکە؟

دوای ئەوەی کوڕەکە هاتەوە لای شافعیو پرسیاری لێکرد، شافعی ووتی: دوو فەرزەکان نیەت هێنانو (الله اکبر)ی سەرەتای نوێژە (تکبیرة الاحرام)ە. بەڵام هەرچی سوننەتەکەیە ئەوا بەرزکردنەوەی هەردوو دەستەکانە هەتا ئاستی گوێچکەکان.

دوای ئەوەی کوڕەکە هاتەوە خزمەت دوو زانایەکەو وەڵامی شافعی پێ راگەیاندن. ووتیان: ئەوە ووتەی کەسێکی شارەزایە لە شەرعدا. بۆیە ویستیان شافعی بناسن هەردووکیان چوونە لای شافعیو پرسیاری زانستو بنەماڵەیو شوێنی لە دایك بوونی لێکرد ئینجا شافعی وەڵامی

پرسیارەکەی دانەوە. ئینجا (کوڕی حسن) میوانداری پێشەوا شافعی کردو ڕێگەی پێدا چەندی حەز ئەکا لە پەرتوکەکانی نێو پەرتوکخانەکەی، سوود وەربگرێتو لەبەریان بنووسێتەوە.

شافعی بە ئەندازەی لەبەرگرتنەوەی ئەو پەرتوکانەی مەبەستی بوون لە خزمەت (کوڕی حسن) مایەوە. کاتێکیش کە ویستی گەشتێکی دیکە بکات ئەو پەرتوکانەی لەبەری گرتبوونەوە نیشانی (کوڕی حسن)ی دا، ئەویش زۆری پێخۆش بوو، پشتگیری لێکردو سی هەزار پارەی دایە بۆ ئەوەی لە گەشتەکەی یارمەتی بدات، شافعیش پارەکەی لێوەرگرت دوعای چاکەی بۆ کرد.

## ٦- گەشتی سێیەم بۆ وڵاتی فارس:

دوای ئەوەی ئەو پەرتوکانەی ویستی- لەنێو پەرتوکخانەی محمد کوڕی حسن- لەبەری گرتەوە، لەساڵی (١٧٢)ی کۆچی لەشاری کوفە بەرەو وڵاتی فارسو دەوروبەری بەڕێ کەوت، پاشان بۆ باکوری غێراق هەتا گەیشتە باشوری وڵاتی رۆم- ئەنادۆڵ، پاشان چووە حەرانو دوایش بۆ فەلەستین رۆیشت.

گەشتەکەی دوو ساڵی خایاند، زانیاریەکی باشی بەدەست هێنا لەو زانایانەی کە بەخزمەتیان گەیشت... لەم گەشتەیدا پێشەوا شافعی زیاتر شارەزای کارویارو رەوشتو هەڵسوکەوتی خەڵك بوو. پاشان دوای گەشتەکەی چووە شاری مەدینەی پیرۆز بە مەبەستی سەردان کردنی

پێشەوا مالیك چونكە زۆری حەز نەكرد بیبینێ. دوای بیستو حەوت رۆژ ئینجا گەیشتە نێو شارو چووە نێو مزگەوتی پێغەمبەر لەوێش نوێژی عەسری بەئەنجام گەیاند، دوایی سەلامی لە پێغەمبەر (ﷺ)و دوو هاورێیەكەی (رەزای خوایان لێبێت)كرد. پاشان چووە خزمەت وانەكانی پێشەوا مالیك. دوای ئەوە پێشەوا مالیك بە هاتنەكەی زانی بانگی كردە لای خۆیو بەخێرهاتنی لێكردو دەبەرە خۆی وەرینا و بەخەلكیشی ناساندەوە، داواشی لێكرد وانەكە تەواو بكات. دوای ئەوەی پێشەوا شافعی لە ووتنی وانەكە تەواو بوو، پێشەوا مالیك بردیەوە مالی خۆی. ئینجا پێشەوا شافعی چوار سالو چەند مانگێك لەشاری مەدینە لەخزمەت پێشەوا مالیك مایەوە (رەزای خوای لێبێت).

## ٧- گەشتی چوارەم بۆ یەمەن:

پێشەوا شافعی سەردانی شاری (مەككەی) پیرۆزی شوێنی لەدایك بوونیو مامۆستا بەرێزەكانی- كردەوە.

پاشان چووە دیدەنی خزمەكانیو داوای یارمەتی دارایی لێكردن تاوەكو هەندێك لە پێویستیەكانی خوێندنی- وەك پێداویستی نوسینو گەشت كردن بۆ وەدەست هێنانی زانستی زیاتر- لەسەر شانی سوك بكات بەلام. خزمەكانی وەلامی داواكەیان نەدایەوە ئەوە هەیە هەندێكیان چوونە لای دادوەری یەمەن- كە ناوی مصعب بوو ئەو كات لەنێو شاری مەككەدا بوو باسی پێشەوا شافعییان بۆ كرد، دادوەرەكەش پێشەوا

شافعی بەخێر هێناو پێی ووت: ئەمیری برواداران فەرمانی بۆ نوسیم کە بکاتە دادوەر لەیەمەن ئایا لەگەڵمان دێیت بۆ ئەوێ- تکا وایە خوای گەورە قەرەبووی یارمەتی ئەدانی خزمەکانت بکاتەوە.

پاشان شافعی چووە یەمەن کاری دادوەری گرتە ئەستۆو هەوڵێکی زۆر باشی لەپێناو چاکەی خەڵکی دا، کە لەسەری سوپاس کرا، بەدەست پاکیو رەوشتی باشو زانستی زۆر ناوبانگی لەنێو خەڵك دا بڵاوبوەوە.

ئەم ناوبانگەی لە (یەمەن)ەوە گەیشتەوە شاری مەککەو خەڵکی مەککەش ستایشی شافعییان ئەکردو بە چاکەیان باس ئەکرد. ئینجا دوای ئەوەی ئەم ستایش کردنەو بەچاك ناوهێنانی شافعی گەیشتەوە لای مامۆستاکەی- سفیان کوڕی عیینە- فەرموودە ناسو شارەزاو زانای شاری مەککە. کاتێك شافعی بەسەردان هاتبوەوە ناو مەککە بەخێر هاتنەوەی لێکردو پێی ووت: باسی چاکەکردنی تۆ لەگەڵ خەڵکی یەمەنو بڵاوبوونەوەی ناوبانگی باشەی تۆم پێگەیشتوە. لەوەی لەبەر خوا ئەم چاکانەت کردوە، ئەوە هەیە مەچۆرەوە یەمەن، بەڵام ئەو بە گوێی ئامۆژگاری مامۆستاکەی نەکردو گەڕایەوە یەمەن. دوای ئەوەی گەڕایەوە یەمەن، پۆستی دادوەری (نەجران)یان پێسپارد، لەوێش ناوبانگی باشی بڵاوبویەوە. پێشەوا شافعی هانی خەڵکی ئەدا بۆ سەر سوننەتو یاسای راستو دروست، بەڵام خەڵکی (نەجران)یش هەوڵیان ئەدا شافعی بگۆڕنو هەڵسوکەوتو رەفتاری وەکو خۆیان لێبکەن هەروەك هەمان هەوڵیان لەگەڵ دادوەری پێشوودا ، دابوو، بەڵام لە هەوڵەکەیان لەگەڵ پێشەوادا

سەرکەوتوو نەبوون،

شافعی بەردەوام بوو لە بلاوکردنەوەی دادوەریو راوەدوونانی چەوتو ناڕاستیو خراپەدا. بەڵام هەموو کاتێك- خراپەکاران ئەوانەی رقیان لە بەرپابوونی راستیو دادوەرییە خڕبوونەوە بۆ تێکۆشان لە دژی پێشەوا شافعیدا و هەوڵێکی ناڕەوایانەو ستەمکارانەیان دا لە دژی پێشەوا شافعی، لەلای ئەمیری بڕواداران، ئەگەر خوای گەورە نەیپاراستبایە نزیك بوو بە (کۆتایی هاتنی ژیانی) تەواو بێت.

شافعی گەڕایەوە مەککەی پیرۆزو کۆڕێکی تایبەتی بۆ بڵاوکردنەوەی زانستە شەرعیەکان کردەوە، زۆرێك لە زانایانیش لە کۆڕەکەی بەهرەمەند بوونو گوێیان ئەگرت لە شێوازە تازەکان بۆ هەڵێنجانی بڕیارەکان، هەتاوەکو ژیریان پڕبوو لە زانستو زۆر شتی تازەی لێ فێربوونو لە ئەنجامیشدا گەواهییاندا لەوەی باڵا دەستییەکی تەواوی هەیە لە زانستو تێگەیشتندا.

لەو زانایانەی گەواهی داوە لە باڵا دەست بوونی شافعی لە زانستو زانیاریدا: پێشەوا احمد کوڕی حەنبەل بوو، کە بە سەردان بۆ جێبەجێکردنی فەریزەی حەج هاتبووە شاری مەککەو هاتە نێو مزگەوتی (مسجد الحرام)و چاوی کەوت بە پێشەوا شافعیو (کۆڕە زانستییەکە)و دوای ئەنجامدانی گفتوگۆیەکی تێرو تەسەل لەگەڵ شافعیدا بۆی دەرکەوت کە شافعی خاوەن زانستێکی زۆرو شارەزاییەکی گەورەی هەیە لە شەرعدا بۆیە ووتی.

لەبارەی فەرموودەوە گفتوگۆمان کرد نەمبینی کەسێك وەك ئەو زانا بێت، پاشان لەبارەی شەرع (فقه)دا گفتوگۆمان کرد، لە ئەوم شارەزاتر نەبینی، دوایی گفتوگۆمان لەبارەی (قورئان) کرد نەمبینی لە ئەو زاناترو شارەزاتر بێت، پاشان لەبارەی زماندا گفتوگۆمان کرد زانیم کەوا بۆ خۆی خانەی زمانە لە (زمانو وێژەدا)، هەرگیز چاوەکانم کەسێکی هەڵکەوتووی، وەك ئەوی نەبینیوە.

## ٨- گەشتی پێنجەم بۆ بەغدا:

پێشەوا شافعی چووە بەغداد، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ ناوبانگەکەی پێشی کەوتبوو، زانایانو شارەزایان (فقهاء)و فەرموودەناسانی وێنەی پێشەوا ئەحمەد کوڕی حەنبەڵو عبدالرحمن کوڕی مهدیو ئیسحاق کوڕی راهویە باسی زانایەتیو شارەزایەتیو لێهاتوویی پێشەوایان بۆ خەڵکی بەغداد کردبوو.

پێشەوا شافعی گەیشتە بەغدادو بووە میوان لای (زعفرانی) کە وێژەوانێکی لێهاتووو بە توانا بوو، جگە لەمەش پەیوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراق هەبوو.

پاشان چووە مزگەوتی رۆژئاوای بەغداد، ئەو مزگەوتەی کە کۆڕە زانستییەکانی لێ ئەبەستراو چوو، لەلایەکی نێو مزگەوتەکە کۆڕی تایبەتی خۆی لە پێناو سوود گەیاندن بە خەڵك لەوێ کردەوە تیایدا بنچینەو شێوازەکانی رێبازەکەی باس ئەکرد. ئینجا فێرخوازانو زانایانیش چوونە نێو کۆڕەکەی بۆ سوود وەرگرتن لە شارەزاییو

زانایەتیەکەی پێشەوادا.

شافعی بەردەوام بوو لەسەر بڵاوکردنەوەی زانستەکەی بە پاڵپشت بە هێنانەوەی بەڵگەی زانستی بەهێز لەسەر ئەوەی کە ئەیڵێت. تاوەکو بۆ زانایان روون بووەوە: کە شافعی خاوەن زانستێکی زۆرو بێ شومارە.

لە ئەنجامی ئەمەشدا حسن کوڕی محمد زعفرانی گەواهی ئەدات لەوەی خاوەن لێهاتوویی‌و توانایەکی زۆرە لە زانستداو لەم بارەیەوە ئەڵێت: ((فەرموودەناسان خەوتبوون، شافعی بە ئاگای هێنانەوە، بۆیە ئەوانیش بە ئاگا هاتنەوە)).

زانایان‌و فەرموودەناسان‌و شارەزایانی شەرع (فقهاء)ی خەڵکی عێراق پێشوازییەکی بێ وێنەیان لە پێشەوا شافعی کرد، سوودێکی زۆریان بینی لە زانستە زۆرەکەی. خۆشەویستیەکی کەم وێنەیان بۆ دەربڕی. ستایشێکی زۆریان کرد کە شایانی ئەم ستایش کردنە بوو لەبەر زۆری زانست‌و چاکەی بەرامبەر بە موسڵمانان بەگشتی. بەم جۆرە خەڵکێکی زۆر سوودیان بینی لە زانستی پێشەوا شافعی، کەسێکیان نەبینی وەك ئەو شارەزاو زانا بێت لە شەرع‌و وێژەو زمان‌و شعرو هەڵێنجانی بڕیارەکان‌و تێگەیشتنێکی جوان بۆ فەرموودەکانی خوای گەورە.

## ٩- گەشتی شەشەم بەرەو میسر:

پێشەوا شافعی گەشتێکی کرد بۆ مصر، هۆیەکەشی ئەوەبوو، کە عباس کوڕی عبدالله کوڕی موسی کوڕی عبدالله کوڕی عباس بانگهێشتی کردبوو تاوەکو بچێتە میسر. (عباس)یش جێنشینی عبداللەی

کوڕی مەئمون بوو لە میسر. بۆیە (شافعی)ش داوەت نامەکەی وەرگرتو بەرەو میسر گەشتی کرد.

کاتێك پێشەوا شافعی خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بەرەو میسر بچێت شعرێکی ووت، کە ناوەڕۆکەکەی بە کورتی ئەمە بوو:

ئێرە جی ئەهێڵمو ئەڕۆم بەرەو میسر
بەلاّم من نازانم ئەمە بۆ سەرکەوتنو دەوڵەمەندیە
یاخود بۆ مردنو نێو گۆڕ

شافعی لەم شعرەیدا پرسیاری ئەوە ئەکات ئاخۆ ئایا دەوڵەمەند بوونو سەرکەوتنە ئاوا دڵی بۆ میسر کەمەندکێش ئەکات یاخود بۆ مردنو چوونە شوێنی هەتا هەتایی نێو گۆڕە؟

قەدەری خوا وەلاّمی دایەوە کە بۆ هەردووکیان ئەچێت، چونکە لەوێ (لە میسر) دەوڵەمەند بوو بەهۆی ئەوەی هەندێك مولكو ماڵی میراتی خزمو کەسەکانی بەرکەوت.

بەهەمان شێوە سەرکەوتنی بە دەست هێنا بەهۆی بلاوکردنەوەی زانستو بیرو راکانیو رێبازەکەی لە شەرعدا، پاشان مۆڵەتی ژیانی دونیای تەواو بوو لە میسر لە ساڵی (٢٠٤) کۆچیو لە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵی، کۆچی دوایی کردو هەر لەوێش نێژراوە.

دوای ئەوەی خەڵکی بەغداد بە نیازی گەشتکردنی پێشەوایان زانی لەوەی بەغداد بەجێ ئەهێڵێو ئەچێتە میسر، هەموویان چوونەدەر تاوەکو ماڵئاوایی لێبکەن، لە پێشیاندا ئەحمەد کوڕی حنبل کە یەکێك بوو لە

قوتابیە گەورەو بەرێزەکانی پێشەوا شافعی، ئامادەبوو بۆ ماڵئاوایی کردنەکە.

شافعی هەستی بەوە کردبوو مانەوەی لە میسر کۆتا شوێنیەتی لەم دونیایەو زۆر شوێن گەڕاوەو مانەوەکەی لەوێ ماوەیەکی زۆر نەبات، بۆیە جارێکی دیکە ئەحمەدی کوڕی حنبلو ئەوەی لەگەڵیەتی لە خەڵکی بەغداد- جارێکی تر چاوی بەمانە ناکەوێتەوە، بۆیە سۆزی جولاو گریا، ئەم گریانەش کاری کردە سەر خەڵکی چواردەورەکەیو ئەوانیشی بە گریان هێنا. کاتێك کوڕی حنبل لە مەراسیمی ماڵئاوایی کردنەکە گەڕایەوە، ووتییە ئەوانەی لەگەڵی بوون: ((شەرع (فقە) داخرابوو بەڵام شافعی دەرگاکەی کردەوە)).

هەندێك لە قوتابییەکانی پێشەوا وەکو: عبداللەی کوڕی زبیر (الحمیدي)و ربیع (المراوي) هاورێیەتی گەشتەکەیان کرد بۆ میسر.

شافعی گەیشتە میسرو چووە لای خزمەکانی لە نەوەی (ازد). پاش ئەوەی زانای بەناوبانگ عبدالله کوڕی حکم کە یەکێك بوو لە زانا پایە بەرزەکانی میسر بە هاتنی شافعی زانی سەردانی کرد بۆ ئەوەی هەندێك لەو ئەرکەی لەسەریەتی بەجێبهێنێت. چاوی بە شافعی کەوتو پێشوازییەکی گەرمی لێکردو پەرتوکی (الموطأ)ی لەگەڵ ووتەوە دوای رێزگرتنێکی زۆریش چوار هەزار دیناری پێشکەش کرد.

دوای گیرسانەوەی پێشەوا شافعی لە میسر لەنێو مزگەوتی عەمر کوڕی عاص دەستی کرد بە وانە ووتنەوە. هەموو رۆژێك دوای نوێژی

بەیانی دەستی ئەکرد بە وانە ووتنەوەو کۆڕەکەی، بەم شێوەیە، بەپێی زانستە جۆر بە جۆرەکانی دابەش کردبوو:

یەکەم: راستەوخۆ دوای ئەنجامدانی نوێژی بەیانی هەندێك ئایەتی قورئانی ئەخوێندەوەو راڤەی ئەکردنو پاشان وەڵامی پرسیاری ئامادەبووانی ئەدایەوە، بەم شێوەیە بەردەوام ئەبوو تاوەکو رۆژ هەڵئەهات.

دووەم: دوای ئەوەی رۆژ هەڵ ئەهاتو ماوەیەك بەرز ئەبووەوە هەموویان نوێژی چێشتەنگاو (الضحى)یان ئەنجام ئەدا. فێرخوازانی قورئانو تەفسیر ئەڕۆیشتن، ئینجا نۆرەی فێرخوازانی فەرموودە ئەهات، پێشەوا شافعی دەستی بە ووتنەوەی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەکرد. پێشەوا (رەزای خوای لێبێت) لەکاتی ووتنەوەی وانەکاندا ئازادی بیرکردنەوەی تەواوی ئەبەخشی بە قوتابییەکانیو پێی ئەووتن: ((ئەگەر نیشانەو بەڵگەیەکم بۆ باس کردن کە ژیری ئێوە وەری نەئەگرتو بە ناتەواوی دائەنا، ئەوا پێی رازی مەبن چونکە ژیری پێویستە راستی وەربگرێت)).

سێیەم: کاتێك (رۆژ) ماوەیەکی زۆر بەرز ئەبووەوە فێرخوازانی فەرموودە ئەڕۆیشتنو نۆرەی فێرخوازانی شەرع (فقە) ئەهات. ئینجا ئەوانیشی فێرە پاكو خاوێنی (طهارة)و پەرستش (عبادة)و مامەڵە (معاملة)و سنوورەکان (حدود)و شێوازەکانیانی لەنێو شەرعدا فێر ئەکردن.

چوارەم: دوای ئەوەی کاتی خوێندنی فێرخوازانی شەرع کۆتا ئەهات فێرخوازانی وێژەو شعرو رێزمان ئەهات ئەوانیشی فێر ئەکردن. بەم جۆرە لەگەڵ فێرخوازەکانی ئەمایەوە تاوەکو نوێژی نیوەڕۆشی ئەکرد. ئینجا ئەگەڕایەوە ماڵەوە بۆ پشووودانو خوێندنەوە.

پێشەوا شافعی بەم شێوەیە رۆژەکانی لە بلاوکردنەوەی زانستو زانیاریدا بەسەر ئەبرد. ئەم رەفتارەش هەمان هەڵسوکەوتو رەفتاری گەورە پێشەوایانو بانگخوازانە لە هەموو سەردەمو شوێنێکدا.

## ١٠- مامۆستاو رابەرەکانی:-

پێشەوا شافعی سەرەتا لە خزمەت مسلم کوڕی خالد (الزنجي) دەستی پێکرد، پاشان چووە خزمەت سفیان کوڕی عیینەو سعید کوڕی سالم (القداح)و داود کوڕی عبدالرحمن (العطار)و عبدالحمید کوڕی عبدالعزیز کوڕی ئەبو داودو لەخزمەت ئەمانە زانستی خوێند. ئەمانە هەموویان زانایانی هەڵکەوتووی شاری مەککەی پیرۆز بوون.

بەڵام مامۆستایەکانی خەڵکی مەدینەی پیرۆز ئەمانە بوون:

مالیك کوڕی ئەنەس، ئیبراهیم کوڕی سعد ئەنساری، عبدالعزیز کوڕی محمد (الدراوردي)، ئیبراهیم کوڕی یحیی (الأسامي)، محمد کوڕی سعید کوڕی فدیك، عبدالله کوڕی نافع (الصائغ) بوون.

<u>مامۆستاکانیشی لە یەمەن ئەمانە بوون:</u>

مطرف کوڕی مازن، هشام کوڕی یوسف، عمر کوڕ ی ئەبو سەلەمە، یحیی کوڕی حسان بوون.

**مامۆستایانیشی لە عێراق:**

محمد کوڕی حسن، وەکیع کوڕی جەراح، ئەبو ئوسامە حماد کوڕی ئوسامە، ئیسماعیل کوڕی عطیە، عبدالوهاب کوڕی عبدالحمید بوون.

جگە لەوەش پێشەوا شافعی سوودێکی گەورەی بینی لە پەرتوکەکانی محمد کوڕی حسنو هەروەها لە لێکۆڵینەوەی لە شەرع (فقـە)ی عێراقـیو گفتوگۆکانی لەگەڵ شەرع زانەکاندا سوودێکی بێ پایـانی بینـی. هـەموو ئەمانە رێگەی بۆ ئاسان کرد لەوەی بـەراوردێك بکـات لـە نێـوان فقهـی مەدینـەو عێـراق، ولـەنێوان (فقـە)و ژیـری (عقـل)و گوازرایـەوە (نقـل) بەهەمان شێوە ئەمە یارمەتیدا بۆ داڕشـتنی بنـچینەو بنـەمای شـێوازو رێساکانی لە رێبازەکەیدا.

## ١١- قوتابییەکانی پێشەوا:

قوتابییەکانی پێشەوا زۆر بوون. ئەمەش لەبەر زۆری گەشتەکانی بـوو لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە. لەمـەودوا ژمارەیـەك لـە قوتابییـەکانی پێشەوا (رەزای خوای لێبێت) لەو شوێنانەی لێـی نیـشتەجێ بـووە، بـاس ئەکەین.

### یەکەم/ قوتابییەکانی پێشەوا لە مەککەی پیرۆز:

لە دیارترین قوتابییەکانی پێشەوا لە مەککەی پیرۆزدا ئەمانە بوون: ئەبوبەکر ئەلحومەیدی، ئەبوبەکر محمد کوڕی ئیدریس، ئیبراهیم کـوڕی محمد کوڕی عباس، ئیبراهیم کوڕی عبداللـە (الحجبـي)، ئیـبراهیم کـوڕی ئەبو حەییە، زبیر کوڕی سلیمان قورەیـشی، محمـد کـوڕی بـشیر شـەیبی،

موسى كوڕى ئەبو جارود بوون.

## دووەم/ قوتابییەكانى پێشەوا لە بەغداد:

لە دیارترین قوتابییەكانى لە بەغداددا: پێشەوا احمد كوڕى حنبل، حسین كوڕى علی ئەلكرابیی، حسن صباح زعفرانی، احمد كوڕى محمد ئەشعەری، ئەبو ثور (الكلبی)، عبدالرحمن كوڕى مهدی، عبدالرحمن كوڕى عبدالله كوڕى سوار (العنبری)، علی كوڕى زید، عبدالله كوڕى محمد عەقیل بوون.

## سێیەم/ قوتابییەكانى پێشەوا لە میسر:

لە دیارترین قوتابییەكانى لە میسر: حرملە كوڕى یحیی، یوسف كوڕى یحیی بوەیطی، ئیسماعیل كوڕى یحیی (المزني)، محمد كوڕى عبداللە، كوڕى عبدالحكم وەربیع كوڕى سلیمان ئەلجیزی،وحسن كوڕى عبدالعزیز جروی،و زید كوڕى بشر حەضرەمی بوون، .

نەمتوانی باسی هەموو قوتابییەكانى پێشەوا بكەم چونكە ژمارەیان زۆر زۆرە، هەمویان جوانترین ڕێزی پێشەوا شافعی یان ئەگرت كە شایانی بەرزی پلەو پایەی زانستی ئەو بوو. تا ئەمە پێشەوا ئەحمەد كوڕى (حنبل)ە- پێشەوای ئەهلی سوننەتو جماعەت لە تەنیشت پێشەوا شافعی بە ڕێدا ئەڕوات، پێشەوا سواری گوێ درێژێك بووەو پێشەوا ئەحمدیش لە تەنیشتیەوە ئەڕواتو وانە ئەخوێنێت.

کاتێك یحیی کوڕی معین بەمە ئەزانێ ڕەخنە لە ئەحمەد کوڕی حنبل نەگرێت‌و پێی ئەڵێت: ((ئەگەر تۆ لەلایەکی دیکە بووایە لەکاتی ڕۆیشتن لەگەڵ پێشەوادا ئەوا بۆ تۆ باشتر ئەبوو)).

## ١٢- شارەزایی‌و (فقه)ی پێشەوا:-

شارەزایی‌و تێگەیشتنی‌و (فقه)ی پێشەوا نموونەیەکی رازاوەو جوانی (فقهی) بوو لە مێژووی یاسادانان (تشریع)ی ئیسلامدا چونکە هاوسەنگی‌و گردبوونەوەیەکی دروست کردبوو لە نێوان تێگەیشتنی (فقه) خاوەن ئەزموونی ژیری‌و بیروڕاو لە نێوان تێگەیشتنی (فقه)ی شوێنکەوتن‌و پابەندبوون (نقل)و فەرموودەدا... ئەو شوێنکەوتن‌و پابەندبوون (نقل)ەی سوننەت‌و پێوانەکردن (قیاس)و بیروڕا، هاوسەنگ ئەکات. ئەو شەرعەیە کە سنوورێك دائەنێت بۆ ڕێگاکانی تێگەیشتنی قورئان‌و سوننەت‌و ڕێساکانی هەڵێنجان‌و دەرکردنی بڕیاری شەرعی.

بەم جۆرە پێشەوا شافعی توێژینەوەی شارەزایی (فقه)ی زانایانی مەدینەو شارەزایی (فقه)ی عێراق کردو بەراوردی هەردووکیانی کرد، گفتوگۆی لەگەڵ خەڵکی مەدینەو عێراقدا کردوون دوای شارەزابوون‌و زانیاری‌و ئەزموونێکی زۆر لە بواری زانستە شەرعیەکاندا دوای ئەمانە هەمووی، ئینجا ڕێبازەکەی لەسەر ئەم بنەمایانە داڕشتووە:

ڕەچاوکردنی قورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و کۆدەنگی زانایان‌و پێوانەکردن (قیاس) بوو:

هەمان ئەو بنەمایانەن کە لـە پـەرتوکی (الرسـالة)دا باسـی کـردوون ئەوانەی کە لە شێوەی رێساو بنەمای تازەو نـوێ لـە چوارچـێوەی فقهـی ئیسلامدا لەلای شارەزایان (فقهاء) خۆیان ئەنوێنن.

جگە لەمە پێشەوا شافعی بنەمای ((بە چـاك دانـان- الاستحـسان)ی پوچـەل کـردەوەو پـەرتوکێکی لـەم پێنـاوەدا دانـا بـە نـاوی (ابطـال الاستحسان)) کە ئەو بنەمایەیە پێشەوا ئـەبو حەنیفـەو پێـشەوا مالیـك لەکاتی دەرکردنـی بڕیـارە شـەرعیەکاندا کاریـان پێکـردوون... پێـشەوا شـافعی هۆکـاری کـار پێنەکردنەکـەی ئـەم بنەمایـە بـەم شـێوەیە روون ئەکاتەوە:

((کۆشش کردنو هـەوڵ دان بـۆ دۆزینـەوەی بڕیـاری شـەرعی لـەبارو گونجاو بۆ کێشە دیارکەوتووەکان بـە ڕێگـای بنـەمای (بـە چـاك دانـان- الاستحسان) بەبێ ئەوەی پشت ببەستێت بـە بنەمایـەکی شـەرع یـاخود دەقێکـی قورئـانو سـوننەت ئـەوا هـەوڵێکی پوچـەڵو هەڵەیـە، بۆیـە ئەنجامەکەشی بەهەمان شێوە بێ (بەرهەم)ە، وپوچەڵیشە)).

بـەم جـۆرە ڕێبازەکـەی لـەنێو مەککـەی پـیرۆزو بەغـدادو میـسر بڵاوبووەوە، بـەڵام ئەسـتێرەی گەشـاوەی زیـاتر لـە میـسر بـوو، بـەهۆی گۆڕانکاریەکانی ژینگەو کۆمـەڵگاش زۆرێـك شـتی تازەیـان خـستەسەر ڕێبازەکەی، بەهەمان شێوەو لەبەر هەمان هۆکاری گۆڕانکـاری، هەنـدێك لە راو بۆچوونەکانی (خـۆ)شـی گـۆڕیو هـەمواری کـردن، بـەردەوامیش ئەیووت: ((لەهەر کوێیەك فەرمودەی راستو دروستی پێغەمبەر (ﷺ)



هەبێت ئەوا رێبازی منیش لەوێیە.. واتە رێبازی من فەرموودەی راستو دروستی پێغەمبەرە (ﷺ))).

پێشەوا (رەزای خوای لێبێت) رقی لە تازە داهێنراوەکان (بدعة) لە ئاییندا ئەبووەو پێی ناخۆش بوو، خۆی لێ ئەپاراست.

## ١٣- دانراوەکانی پێشەوا:

پێشەوا شافعی (رەزای خوای لێبێت) لە خێرایی دانانی پەرتوکەکانداو لەگەڵ هەبوونی ووردبینیو دانانێکی رێكو پێكو پێگەیشتوو، کەسێکی لێهاتووو بێ وێنە بوو. ژیری مرۆڤ سەراسیمە ئەما لەوەی ژمارەیەکی زۆری پەرتوکی داناوە لەگەڵ ئەوەی تەمەنیشی زیاتر نەبووە لە پەنجاو چوار ساڵ.

پێشەوا شافعی (رەزای خوای لێبێت) (١١٣) پەرتوکی لەبارەی شەرعو راڤەی قورئانی پیرۆزو ئوصولو وێژەو جگە لەمانەش داناوە. زۆربەی ئەم پەرتوکانەشی لە پەرتوکی (الام)دا کۆکردۆتەوە. بەهەمان شێوە پەرتوکی ((الرسالة))ی داناوە کە باس لە رێساو بنەماکانی شەرع (اصول الفقه) ئەکات، هەروەك کاتێك لە عێراق بوو پەرتوکی (الحجة)ی داناوە.

هەروەها ئەمانەش پەرتوکەکانی پێشەوا (شافعی)ن: (الوصايا الكبيرة، اختلاف اهل العراق، وصية الشافعي، جماع العلم، ابطال الاستحسان، جامع المزني الكبير، جامع المزني الصغير، الأمالي، مختصر

الربیع و البویطي، الاملاء).

هەروەها دیوانێكی (شعر)یشی هەیەو جگە لەمانە لەو پەرتوكانەی بە خۆی نووسیویەتیەوە یاخود بیرۆكەكانی هی ئەو بێتو یەكێكی تر بۆی نوسیبێتەوە.

## ١٤- بەڵاو ناخۆشییەكانی پێشەوا:

حماد بەریەری لەلایەن هارون رەشید كرابووە دەسەڵاتداری یەمەن. لەو كاتەی بەرەو یەمەن ئەچو، هەندێك لە قورەیشییەكان بە (حماد)یان ووت: پێشەوا شافعی بكە بە راوێژكارت بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات لە هەڵسوڕاندنی كارەكانت لە یەمەندا، چونكە ئەو كەسێكی زاناو قسەی كاریگەرو دامەزراوەو نەتوانێت پشتی پێ ببەستیت بۆیە حمادیش رازی بوو، ئینجا داوای لە پێشەوا شافعی كرد كە لەگەڵی بچێت بۆ یەمەن، پێشەوا شافعی (شافعی)ش رازی بو، لەوێ پۆستی لە یەمەن پێسپێردرا. دەسەڵاتداری یەمەنیش ئەویویست سوودو قازانج لە ناوبانگی چاكەو بەرزی پلەو پایەی زانستی پێشەوا شافعی ببینێت بۆ ئەوەی بەهۆی ئەوەوە بتوانێت خۆی پێ دەوڵەمەند بكاتو داوای لە پێشەوا شافعی كرد كە یارمەتی بدات بۆ بەدەست هێنانی پارەو مولكو بێ ئەوەی مافێكی بەسەر ئەو مولكو پارانەوە هەبێت، بەڵام پێشەوا شافعی نەیویست لەم ستەم كردنەو كۆكردنەوەو خواردنی مولكو ماڵی خەڵك بەشدار ببێت، و یارمەتی بدات بەڵكو هەمیشە رێگەی راستو خوای گەور بە بیر

ئەهێنایەوەو (مو – بەمو) لەگەڵ شەرعی خوای گەورەدا بوو، بەردەوامیش بۆی لە بۆ سەدابوو نەوەك دەسەڵاتدار کردەوەی خراپ یاخود فەرمانی ستەمکارانە دەربکاتو هەمیشە رێی لێ ئەگرت لەوەی خراپەو خراپەکاری بەرپا بکات، بۆیە دەسەڵاتدار ئەمەی زۆر پێ ناخۆش بوو، ئەیویست تووشی بەڵایەکی بکات بۆ ئەوەی خۆ لە پێشەوا رزگار بکات.

بەڵێ بەم جۆرە دەسەڵاتداری یەمەن نامەیەکی بۆ هارون رەشید نووسی لەو کاتەشدا هارون رەشید ئەمیری بڕواداران بوو، زۆریش رقی لە عەلەویە (شیعە)کان ئەبووەوە تیایدا نووسیبوی نۆ کەسی شیعە هەن لەگەڵ شافعیدا ئەیانەوێت دژایەتی ئەمیر بکەنو جەنگت لەگەڵ بەرپا بکەن، بەم شێوەیە دەسەڵاتداری یەمەن ستەمێکی گەورەی لە پێشەوا شافعی کرد چونکە بێ ئەوەی ئاگادار بێت بەکارو نیازی نۆ کەسەکان ئەوی (واتە شافعی) لەگەڵ ئەوان هەژمار کردبوو.

هارون رەشیدیش فەرمانی بۆ دەسەڵاتداری یەمەن دەرکرد کە هەر (دە) کەسەکە قۆڵ بەست بکاتو رەوانەی بەغدادیان بکات. دەسەڵاتداری یەمەنیش فەرمانەکەی بەجێ هێناو شافعی لەگەڵ هەر (نۆ) کەسەکەی گرتو قۆڵو بازویان لە ملیان بەستنەوەو بە هەندێك سەربازی تایبەتیدا رەوانەی بەغدادی کردن، ئەم رووداوەش لە ساڵی (١٨٤)ی کۆچی بوو.

دوای ئەوەی گیراوەکان گەیەنرانە بەغدادو نیشانی هارون رەشیدیان دا لەو کاتەشدا (محمد کوڕی حسن شەیبانی سەرۆکی) دادوەران لەلای هارون بوو، هارون فەرمانی کوشتنی هەر (نۆ) شیعەکانی دەرکرد، کاتێکیش

نۆرە هاتە سەر شافعی بۆ ئەوەی بڕیارێکیش لەسەر چارەنووسی ئەو (واتە شافعی) دەربکات، محمد کوڕی حسن ووتی: ئەی ئەمیری بڕواداران ئەمە (واتە شافعی) زانایەکی گەورەو لێهاتوو. (شافعی)ش ووتی: ئەی ئەمیری بڕواداران چی ئەڵێی لەبارەی دوو پیاو یەکێکیان بە برای خۆی دام ئەنێت، ئەوەی دیکەش بە بەندەی خۆی دام ئەنێت، ئایا بە ڕای تۆ کامەم خۆشتر ئەوێت؟ هارونیش ووتی: ئەوەی بە برات دائەنێ. شافعیش ووتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، ئێوە ئەوەی عەباسن (ڕەزای خوای لێبێت) ئێمەش ئەوەی (مطلب)ین بۆیە ئێوە، ئێمە بە برای خۆتان دائەنێن، بەڵام ئەوەی علی بە بەندەی خۆیانیان هەژمارمان ئەکەن، ئایا چۆن یارمەتی ئەوان ئەدەمو دژی ئێوە ڕائەوەستم؟ بۆیە هارون ڕەشید لە پێشەوا شافعی خۆشبوو، بە محمد کوڕی حەسەنی سپارد. بەم جۆرە پێشەوا شافعی ناخۆشییەکەی لەسەر لاکەوت.

کاتێکیش پیاوێك پرسیاری لە پێشەوا شافعی کرد، ووتی: ئەی ئەبو عبدالله، کامەیان بۆ پیاو باشە، دامەزراو بێت یاخود تاقی بکرێتەوە؟ پێشەواش ووتی : پیاو دامەزراو نابێت تاوەکو تاقی نەکرێتەوە، چونکە خوای گەورە نوحو ئیبراهیمو موسیو عیسیو محمدو پێغەمبەرانی (ﷺ) تاقی کردۆتەوە ئینجا دوای ئەوەی ئەوان خۆڕاگر بوون دامەزراوی کردوون، بۆیە هەرگیز گومان نەبەن لەوەی لە ناخۆشیو ئازار خەلاس ئەبن. پاشان شافعی گەڕایەوە شاری مەککەی پیرۆز...

## ١٥- كۆچی دوایی پێشەوا:-

پێشەوا شافعی بەردەوام بوو لەسەر بڵاوكردنەوەی زانست لە ناوچە جیاجیاكانی سەر زەوی، بەردەوامیش قسەی راستو هەقی ئەكرد، جگە لە خوای گەورە ئەگەرنا لە كەسی تر نەئەترسا، بەردەوام بوو لەسەر كاری چاكە خوازیو، فێركردنی فێرخوازانو رێنمونی كردنی خەڵكی بۆ سەر رێگای راستو دروست تاوەكو لە ئەنجامی تووش بوونی بە نەخۆشییەكی كوشندە تووشی خوێن بەربونێكی قورس هاتو لەماڵەوە كەوت. كاتێكیش ((مزني)) قوتابی سەردانی كردو هەواڵی پرسی پێشەوا ووتی: خەریكە لە دونیا كۆچ بكەمو جودا ببمەوە لە برایان، پەرداخی مردن بنۆشمو بە خزمەت خوای گەورە شاد ببمەوە، بەڵام سوێند بەخوا نازانم ئاخۆ گیانم ئەچێتە بەهەشت تاوەكو پیرۆزبایی لێبكەم یاخود ئەچێتە دۆزەخ تاوەكو سەرەخۆشی لێبكەم دوایی گریا...

پاشان قسەی لەگەڵ كەسو كارەكەی كردو پێی ووتن: ئەگەر مردم برۆنە لای دەسەڵاتدارو داوای لێبكەن كە بمشۆرێت.

دوایی كوڕە مامەكەی پێی ووت: ئەڕۆین نوێژ ئەكەین، ئینجا ئەگەڕێینەوە پێشەوا شافعیش ووتی: ئایا دائەنیشنو چاوەڕێی گیان دەرچوونی من ئەكەن.

ئێمە رۆیشتینو لە مزگەوت نوێژمان ئەنجامدا، پاشان گەڕاینەوەو پێمان ووت: ئایا نوێژت كردووە؟ ووتی: بەڵێ ئینجا داوای ئاوی كرد، كاتەكەش زستان بوو، پێمان ووت: ئایا ئاوی گەرمی تێكەڵ بكەین؟ ووتی: ئاوی سەفەرجەلی لەگەڵ تێكەڵ بكەن. پاشان بە ماوەیەكی كەم،

پێش نوێژی بەیانی، کۆچی دوایی کرد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کۆچی دواییەکەشی لە شەوی هەینی دوایەمین ڕۆژی مانگی (ڕەجەب)ی ساڵی (٢٠٤) کۆچی بوو. لە ناچەی (فسطاط)ی قاهیرە نێژرا. مزگەوتێکی گەورەشیان لە قاهیرە بە ناوی ئەوەوە دروست کردووە. غەمو پەژارەیەك باڵی کێشا بەسەر هەموویان. دوای ئەوەی چوونە لای دەسەڵاتدار تاوەکو وەسیەتنامەکەی جێبەجێ بکەن بەوەی دەسەڵاتدار بیشۆرێت هەروەك خۆی وەسیەتی کردبوو، دەسەڵاتداریش ووتی: ئایا پێشەوا قەرزدارە؟ ووتیان: بەڵێ. بۆیە فەرمانی دەرکرد لە ماڵی تایبەتی خۆی قەرزەکەی پێشەوا بدەنەوە پاشان پێی ووتن: بڕۆن تەرمی بشۆرن. ئەوانیش ووتیان: پێشەوا پێی ووتین: کە تۆ تەرمەکەی بشۆریت، دەسەڵاتداریش ووتی: قەرزدانەوەی من شۆردنی ئەوە... پاشان گەڕانەوە تاوەکو تەرمەکەی بشۆن.

بەڵێ دوای شۆردنی تەرمی پێشەوا، بەرەو گۆڕستانیان برد، خەڵکیش بەڕێزێکی زۆرەوە هەوڵی ئەوەیان ئەدا تاوەکو تەرمەکەی لەسەر شانیان دابنێنو بەرەو گۆڕستانی بەرن، ئەمە بەردەوام بوو تاوەکو لە زەوی مناڵەکانی کوڕی عبدالحکم نێژرا.

## ١٦- ئەو قسانەی دوای کۆچی دواییەکەی -لەبارەیەوە- وتراون:-

پێشەوا شافعی (ڕەزای خوای لێبێت) لە سەردەمێکدا ژیا کە زانای پایە بەرزی زۆری تیادا دەرکەوتبوو بەڵام پێشەوا لەناو هەموویاندا هەڵکەوتو ڕێبازەکەی خۆی لە ناوچە جیاجیاکانی زەویدا بڵاوکردەوە. لەبەر نیاز پاکیو دڵسۆزی بۆ خوای گەورەو پێغەمبەر (ﷺ)و

موسڵمانان، زانایان ستایشێکی زۆری پێشەوایان کردووە، تا ئێمە ئێستا هەندێك لە وتەی زانایان باس ئەکەین کە لەبارەی پێشەوا شافعی هەم لەکاتی ژیانیداو هەروەها لەکاتی مردنیشیدا وتویانە.

**١- وتەی سفیان کوڕی عیینەی مامۆستای پێشەوا:**

((ئەگەر شافعی مردبێت، ئەوا باشترین کەسی سەردەم مردووە)) لەو کاتەدا ئەو قسەیەی وت کە پێشەوا شافعی فەرموودەی ئەخوێند لەلای سفیانو کاتێکیش گەیشتە فەرموودەیەك لەبارەی بەندەکان (رقائق) لە هۆش خۆی چوو، ئەوانی چواردەورەی وتیان شافعی مرد. ئینجا سفیانیش ئەم قسەیەی لەبارەی شافعییەوە ووت.

**٢- وتەی فضل کوڕی دکین عمر کوڕی حماد:**

((نەمانبینیوەو نەمانبیستووە کەسێك هەبێت لە شافعی زیاتر، زاناترو تێگەیشتووترو لێهاتووتر بێت)).

**٣- وتەی ئەبو ثە ور:**

((هەر کەسێك گومانی ئەوە ببات یەکێکی هاوتای وەکو محمدی کوڕی ئیدریسی شافعی بینیوە لەرووی (زانایەتی، رەوانبێژی، شارەزایی، لێهاتوویی، دامەزراوی)یەوە، ئەوا درۆی کردووە. لە سەردەمی ئەودا هاوتای نەبوو، کاتێکیش کۆچی دوایی کرد کەسێکی دیکە جێگەی ناگرێتەوە.

**٤- وتەی ئەبو عبید قاسم کوڕی سلام:**

((هاوتای (شافعی)م نەبینیوە کە لە ئەو ژیرترو خواپەرست ترو رەوانبێژترو بیرو رای جوانترو زاناتر بێت))، هەروەها ووتی ((هیچ پیاوێکی وەکو شافعی لێهاتووو داناو زانام نەبینیوە)).

**٥- وتەی ئەحمەد کوڕی حنبل:**

((کەسێکی وەك (شافعی)م نەبینیوە کە کەم هەڵە بکات لە زانستو زانیاری، و توندو پێگیرتر بێت لەسەر پابەند بوون بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) )). هەروەها ووتی: (کەسێکی وەك شافعی زاناترو رەوانبێژترو تێگەیشتووترم نەبینیوە)).

**٦- وتەی جنید:**

((شافعی لەو کەسانە بوو هەمیشە زمانی لە راست ووتنو ئایینـدا نەجولاً)).

**٧- وتەی ئەبو منصور ئەزهەری:**

((پەرتوکەکانو دانراوەکانی شارەزایانو زانایانی ناوچە جیاجیاکانم دیوەو خوێندوومەتەوە، بینیم شافعی لە ناویاندا زاناترو زمان پاراوترو بیرتیژتر بوو)).

## ١٧- له ووته‌كانی پێشه‌وا:-

١- ره‌زامه‌ندبوونی خه‌ڵكی ئاواتێكه‌و نایه‌ته‌دی، كه‌وابوو، بۆ ئامۆژگاری پێت ئه‌ڵێم، رێگای سه‌لامه‌تی‌و به‌ختیاری لای خه‌ڵك نییه، سه‌رنج بده ئه‌وه‌ی بۆ تۆ باشه‌و هۆكاری به‌ختیاری دونیاو دینته پابه‌ندبه پێیه‌وه، واز له خه‌ڵك‌و كاروباره‌كه‌یان بهێنه.

٢- زانست‌و زانیاری باشتره له نوێژی سوننه‌ت.

٣- بخوێنه‌و شاره‌زابه پێش ئه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵات بگریته ده‌ست، چونكه ئه‌گه‌ر ده‌سه‌ڵاتت گرته ده‌ست‌و لێپرسراوی كارێكت پێسپێردرا ئه‌وا له‌به‌ر خه‌ریك بوون به كاری لێپرسراویته‌وه فریای خوێندن ناكه‌ویت‌و ناتوانیت شاره‌زا بیت له ئایین.

٤- هه‌ر كه‌سێك راستگۆ بێت له به‌رامبه‌ر برایه‌تی برایه‌كیدا، ئه‌وا چاو ئه‌پۆشێت له هه‌ڵه‌و كه‌موكورپیه‌كانیدا.

٥- سه‌ركه‌وتن‌و ره‌وشتی جوان‌و به‌رێزی‌و نه‌رم‌و نیانی زانایان ئه‌نجامه‌كه‌ی رێزداری‌و سه‌ربه‌رزی‌و رازاوه‌یی دڵ‌و ده‌روونیانه، له‌لایه‌ن خه‌ڵكی.

٦- هه‌ر كه‌سێك زانست بخوێنێت با ووردبێت ئه‌گه‌رنا ناوه‌ڕۆكی زانستی له ده‌ست ئه‌چێت.

٧-هه‌ر كه‌سێك ئاره‌زووی دونیا ویستی به‌شێوه‌یه‌كی به‌هێز به‌سه‌ریدا زاڵ بێت، ئه‌وا ئه‌بێته به‌نده‌ی خه‌ڵكانی دونیا ویست.

٨- هه‌ر كه‌سێك دادوه‌ر بێت‌و هه‌ژار نه‌بێت له ژیانی دادوه‌ریدا ئه‌وا دزه‌و به ناڕه‌وا ماڵی پێكه‌وه ناوه.

٩- هه‌ر كه‌سێك به گوێیه‌كانی ئامۆژگاری باش یاخود هه‌ر شتێكی له‌م

شێوەیە ببیستێ ئەوا ئەتوانێت بۆ کەسانی دیکەی بگێڕێتەوە، هەر کەسێکیش بە دڵ وەریبگرێت ئەوا هۆشیارو ئاگادارە، هەر کەسێکیش ئامۆژگاری لە رەهەندەکانی کردەوەکە وەریگرێت ئەوا رێنمونی کراوە.

١٠- بەرێزترین خەڵك لە رووی رێزەوە کەسێکە رێزی خۆی لەبەر چاو نەبێتو خۆی بە (بەرێزتر) دانەنێت لە خەڵکی، باشترینیشیان کەسێکە چاکەی خۆی لەبەر چاو نییەو خەڵك بە چاكو باش دائەنێت.

١١- هەر کەسێك بە نهێنی ئامۆژگاری براکەی بکات ئەوا مەبەستی سوود پێگەیاندنو ئامۆژگاری کردنیەتی، هەر کەسێکیش بەبەر چاوی خەڵکییەوە ئامۆژگاری بکات ئەوا رووشکێنی کردووەو لە جیاتی سوود گەیاندن زیانی پێگەیاندووە.

١٢- هاورێیەتی کردنی کەسی بێ شەرمو خراپەکار، مایەی زەرەرمەندیو شەرمەزارییە لە رۆژی دواییدا.

١٣- هەر کەسێك قسەی خەڵکت بۆ بگێڕێتەوە، ئەوا قسەی تۆش بۆ خەڵکی ئەگێڕێتەوە هەر (کەسێك)یشت رازی کرد ئەوا لە ستایش کردنی تۆدا زیادەرۆیی ئەکاتو زیادەی پێوە ئەنێ، بەهەمان شێوە هەر کەسێکت تورە کرد، لەبارەی تۆوە زیادەرۆیی ئەڵێتو زیادەی ئەخاتە سەر.

١٤- هەر کەسێك چاکەی لەگەڵ کردی ئەوا تۆی بەند کردووە، هەر کەسێکیش فەرامۆشت بکات ئەوا تۆی ئازاد کردووە.

١٥- هەر کەسێك خواپەرستیو تەقوا بەهێزو خۆشەویستی نەکات، ئەوا لاوازو ناخۆشەویستە.

١٦- هەمیشە فێرخوازانی هەژارو کەم دەست سەرکەوتووترو لێهاتووترن من لەکاتی خوێندندا بە زەحمەت پەڕاوم بۆ نووسین دەست ئەکەوت.

١٧- هەر کەسێك بە شتی (ناڕەوا) خۆی پێ جوان بکات، ئەوا کەموکوڕیو تاوانەکانی ئاشکرا ئەبن لای خەڵکی.

١٨- خوای گەورە هیچ کەسێك دامەزراو ناکات تاوەکو تاقی نەکاتەوە، چونکە خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی (دردوودی خوایان لێبێت) تاقیکردەوەو ناخۆشی بەسەردا هێناون، ئینجا کاتێك خۆڕاگر بوون ئەوا دامەزراوی کردن.

١٩- کەس گومان نەبا لەوەی رزگاری ئەبێت لە ئازارو ناخۆشی نێو دونیادا.

## ١٨- پەندو وانە وەرگرتن لە ژیاننامەی پێشەوا:-

١- گەشت کردن لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە لە پێناو فێربوونی زانست یاخود بڵاوکردنەوەی ئەرکێکە لەسەر هەموو موسڵمانێك بەگشتی.

٢- هاوڕێ ئەو کەسەیە لە خۆشیو ناخۆشیدا لەگەڵت بێتو بە راستت دابنێت.

٣- نابێت فەرمانی دەسەڵاتدارێکی لە رێ دەرچووی دوور لە خوای گەورە جێبەجێ بکرێت.

٤- هەژاریو نەبوونی شورەیی نییە، بەڵام شورەیی ئەوەیە بە سەرشۆڕیو ملکەچی دەست لەبەر خەڵکی پان بکەیتەوە.

٥- خوای گەورە بەرگری لە کەسانی بڕوادار ئەکات‌و جێگیرو دامەزراویان ئەکات.

٦- رازی بوونی خەڵك بۆ (موسڵمان لە رازی بوونی خوای گەورەوەیە.

٧- خۆڕاگری‌و ئارام گرتن، مرۆۋ ئەگەیەنێتە مەبەست‌و ئاواتی خۆی.

٨- بەهێزی بڕوا دەرگای خێرو خۆشی لە دونیـاو دواڕۆژدا لەسـەر مـرۆۋ ئەکاتەوە.

٩- هەر کەسێك چاکە لەگەڵ یەکێك بکات کە خراپـەی لەگـەڵ کردبێـت ئەوا دڵی ئەوی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە.

١٠- هەر کەسێك بیەوێت بە سەلامەتی‌و بێ ئـەوەی خـەڵك زیـانی پـێ بگەیەنێت، ژیان بەرێتە سـەر، ئـەوا پێویـستە بـە هـەموو شـێوەیەك نەبەدەست‌و نە بە زمان‌و نە بە چاوئازاری هیچ کەسێك نەدات.

١١- هەر کەسێك داوای پلەو پایەی بەرز بکات ئایا زانـستی بێـت یـان شتی تر بێت شەونخونی زۆر ئەبینێت.

١٢- هاوڕێیـــەتی کردنـــی کەســـانی خراپـــەکار مایـــەی ئابڕوچـــوون‌و زەرەرمەندیە لە دواڕۆژدا.

١٣- ئیرەیی (حەسودی) بردن تەنها لە دوو شتانە، یەکەم پیاوێـك خـوای گەورە زانست‌و زانیاری پێبەخشی بێت ئەویش لەنێو خەڵکیـدا بـڵاوی بکاتەوە، دووەمیش پیاوێکی دەوڵەمەندە کە بە شـەوو بـە رۆژ مـاڵی خۆی ئەبەخشێتەوە.

## ١- ناو، بنەماڵە، لە دایك بوونی:

مالیکی کوڕی ئەنەس دووەم لە چوار پێشەوایەکەیە لە رووی لە دایك بوونیەوە، دوای سیانزە ساڵ لە دایك بوونی پێشەوای یەکەم ئەبوحەنیفە لە دایك بووە، کە ئەکاتە ساڵی (٩٣)ی کۆچی.

پێشەوا مالیك، پێشەوای شاری مەدینەی (خانەی کۆچ)و پێشەوای خەڵکی حیجازو یەکێك بوو لە شوێن کەوتووی شوێن کەوتووەکان (تابعی التابعین) شارەزایی لە دین لەنێو شاری مەدینەو حەوت شارەزایەکان لە ئەودا کۆتایی پێهاتن ئەوانیش (واتە حەوت شارەزایەکان- فقهاء السبعة) سعید کوڕی مسیب، و عروەی کوڕی زبیر، و ئەبوبەکر کوری عبدالرحمن کوڕی حارث، قاسم کوڕی محەمەد کوڕی ئەبوبەکرو عبیداللە کوڕی عتبە کوڕی مەسعود، سلیمان کوڕی یسارو خارجە کوڕی زید کوڕی ثابتی ئەنصارییە.

پێشەوا مالیك نزیکەی حەفتا ساڵ ژیا، لە خزمەتکردنی ئیسلامو موسڵمانان.

لە دایك بوونی لە سەردەمی دەسەڵاتی (ولید کوری عبدالملك)ی ئەمەوی بوو، لە سەردەمی (هارون رشید)ی عباسی کۆچی دوایی کرد، پێشەوا مالیك هەردوو حکومەتی ئەمەویەکانو عەباسیەکانی بینی، بەهەمان شێوە بەربەرەکانیو جەنگی نێوانیانی بینی، وە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیو رۆشنبیریشی بینی لە نێوان کۆمەڵگای عەرەبیو فارسیو هیندیدا.

ناوی تەواوی مالیك كوڕی ئەنەس كوڕی عـامر كـوڕی عـەمر كـوڕی غنیمان كوڕی خثیـل كوڕی عەمر كوڕی حارثـە، ئـەو لـە هاوپەیمانـەكانی بەنی تەمیم كوڕی (مرة) بوو.

باپیرەی دووەمی ((ئەبو عامر كوڕی عەمر)) لە هاوڕێیانی پێغەمبـەر (ﷺ) بوو، جگە لە غەزای (بەدر) نەبێت ئەگەرنا لە هەموو غەزایەكاندا لەگەڵ پێغەمبەردا بووە.

باپیرەی یەكەمی ((مالیـك كـوڕی ئـەبو عـامر)) لـە گـەورە شـوێن كەوتووان (التابعین) بووە، نازناویشی ئەبو ئەنەس بووە.

باییشی ئەنەس (تیر) دروستكەر بـووە لـە شـاری مەككـە، لـە ((ذی المروة)) كە تیایـدا ژیـاوە، و شـوێنێكە وەكـو (واحـة)ی بـاكووری شـاری مەدینە، ئەنەس بە ئاشـكرا خـەریكی زانـست نـەبوو، هەرچـەند حـەزو ویستیشی لەسەر هەبوو.

دایكیشی ناوی غالیە كچی شـریك كـوڕی عبـدالرحمن كـوڕی شـریك ئزدی بوو. بنەماڵەی مالیـك زانـا بـوونو خـەریكی فـەرموودەو فـەتواو بڕیاردانی شەرعی بوون.

## ٢- پێگەیشتنی زانستییانەی:-

پێـشەوا مالیـك لـە سـەرەتادا قورئـانی پـیرۆزی لەبـەركرد، ئینجـا فەرموودە پیرۆزەكانی لەبەركرد، یادەوەریەكی بەهێزی هەبوو بە ئاسـانیو بەبێ كـەموكوڕی لەبـەری ئـەكرد، عادەتەكـەی وەهـابوو كـە گـوێی لـە

فەرموودەیەك نەگرت گرێیەکی لەو پەتە نەدا کە لەنێو دەستیدا بوو، ئینجا بۆ هەموو فەرموودەیەك کە گوێ بیستی نەبوو، و نەیخوێند گرێیەکی لێنەدا، دوایی ئەڕۆیشتە ماڵەوەو بەدواداچوونی بۆ ئەو فەرموودانە ئەکرد کە لەبەری کردبوون. ڕۆژێکیان سی فەرموودەی لە (ئیبن شهاب) گوێ لێبوو، جگە لە یەك فەرموودە نەبێت ئەگەرنا هەمووی لەبەرکردن بۆیە بە خێرایی چۆوە لای شهاب پرسیاری ئەو فەرموودەیەی لێکرد کە لەبەری نەکردبوو، ئیبن شهابیش پێی ووت: ئایا لە دانیشتنەکەدا نەبووی؟

مالیك وەڵامی دایەوە: بەڵێ. ئیبن شهاب ووتی: بۆ لەبەرت نەکردوون؟ وەڵامی دایەوە: چونکە سی فەرموودە بوون، تەنها یەك دانەم لەبەر نەکردووە.. کوڕی شهاب ووتی: هێزی لەبەرکردنی خەڵك لاواز بووە؟ هەر شتێك لەبەرم کردبێ لە بیرم نەچۆتەوە، ئەو فەرموودانەی لەبەرتن بیانڵێ، مالیکیش بۆی دووبارە کردەوە، کوڕی شهابیش ئەو فەرموودەیەی پێ ووت کە لە بیری نەمابوو.

پێشەوا مالیك لە سەرەتای تەمەنی حەزی لە خوێندن نەبوو، بەڵکو حەزی لەوەبوو ببێتە گۆرانی بێژو بیکاتە سەرچاوەی ژیاندنی خۆی. بەڵام (عفیفە) خانی دایکی ڕێگر بوو لەوەی ببێتەگۆرانی بێژو فێربوونی زانستە شەرعییەکانی بۆ هەڵبژارد و ویستی بۆی بسەلمێنێت کە شارەزا بوون لە ئاین باشترە لە گۆرانی ووتن، بۆیە بەرگی زانایانی ئەو کاتەی پێ پۆشی‌و، پێی ووت:- بڕۆ لای ربیعەی کوڕی باوکی عبدالرحمن، کە لەو

کاتەدا فێرکارو مامۆستا بوو لە ناوچەکەیانو پێی ووت:- سەردانی بکەو ئەدەبو ڕەوشت فێرببە پێش ئەوەی زانست بخوێنیت.

پێشەوا مالیك لە بارەی ئەم ڕووداوە بۆمان ئەلێت:- تەمەنم پێگەیشتو حەزم لەوە بوو ببمە گۆرانی بێژ، دایکم پێی ووتم:- ئەی کوڕم ئەگەر هاتوو گۆرانی بێژ ڕەنگو ڕووی ناشرین بێت کەس گوێ لە گۆرانیەکەی ناگرێت، بۆیە واز لە گۆرانی بهێنەو فێرە زانستە شەرعییەکان بە، بۆیە منیش وازم لە (گۆرانی بێژان) هێناو شوێن شارەزایانو زانایانی ئایینی کەوتمو لێیان فێربووم، ئەبینی خوای گەورە چ ڕێزێکی پێداوم.

پێشەوا مالیك دەمو چاو ناشرین نەبو هەروەك دایکی پێی ووتبو، زۆر ڕێكو پێكو جوان بوو، بەڵکو بۆیە پێی ووتبو تاوەکو واز لە گۆرانی بهێنێت، چونکە ئەیزانی سەرەنجامی گۆرانی ووتن سەرەنجامێکی ناخۆشو بە ئازارە لەلای خوای گەورە.

جا پێشەوا مالیك پۆشاکی زانایانی پۆشیو ڕۆیشتە قوتابخانەکەی مامۆستا ڕەبیعە.

بەمجۆرە پێشەوا مالیك لە تەمەنی منالّیدا دەستی بە خوێندنی زانستە شەرعییەکان کردو تا لە دواییدا بووە یەکێك لە پێشەوا ناوازەکانی ئومەتی موسڵمانانو بەمەش دایکی پێشەوا گەورەترینو بەنرخترین دیاری پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد.

## ٢- شاری زانستو زانیاری (مدینه المنوره):-

یەکێك لەو هۆکارانەی مالیکی کردە پێشەوایەکی دیارو بەرچاو کە هەموو کەسێك ڕێزی ئەگرت، هۆکارەکەی- ژیانو پێگەیشتنی بوو لە نێو شاری مەدینەی پیرۆزدا، مەدینەی پێغەمبەری خوا محمد (ﷺ).

لە سەردەمی منالّی پێشەوا (مالیك)دا مەدینە پڕ لە زانا باشو بەناوبانگەکانی شوێن کەوتوان (التابعین) بوو. لە شاری مەدینەدا قوتابخانەیەکی گەورە هەبوو بۆ فێرکردنی زانستە شەرعییەکان- بە هەموو جۆرەکانیەوە- ئەویش لە نێو مزگەوتی پێغەمبەردا بوو (ﷺ). لە هەموو لایەکانی نێو مزگەوتدا کۆڕێکی زانستی لێبوو، لە هەر کۆڕێك دا زانایەکی بەتوانا سەرپەرشتی ئەکرد، وەکو ڕەبیعەی کوڕی باوکی عبدالرحمنوکوڕی هرمزو نافعو کوڕی شەهاب الزهريو محمد کوڕی مکندرو جعفر صادق کوڕی محمد باقر سەرۆکی ئالی بەیتی پێغەمبەر لەوێ بوون.

لەو دەمەدا هێشتا نزیك بوون لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوڕێ بەڕێزەکانی، بۆیە بڕیارو فەتوا شەرعیەکانو فەرموودەکانی پێغەمبەر هێشتا لە دلّدا بە لەبەری مابوونەوەو لەسەر زماندا بوون، شارەزایی (الفقه)ی عبداللەی کوڕی عمرو عبداللەی کوڕی مسعودو سعیدی کوڕی مسیبو ئەوەش کە لە تۆمارەکاندا لە بابەتە شەرعیەکان یاخود ئەو حوکمو بڕیارانەی لێیان هەلێنجابوون هێشتا ئەوە دوای ئەوە لە کۆڕە زانستیەکاندا ئەووترانەوە.

بۆیە موسڵمانان متمانەو دڵنیاییان بە زانایانی شاری مەدینە هەبوو چونکە لە قوتابخانەی پێغەمبەرایەتیدا فێربووبوونو ڕەوشتە چاکەکانی هاوڕێیانیان (صەحابەکانیان) وەرگرتبوو، و بڕیارو حوکمی شارەزایان (الفقهاء)و زانستەکانی شوێنکەوتووە یەکەمینەکانیان ئەخوێندو توێژینەوەیان لەسەر ئەکرد. زانایانی هاوڕێیان خوا لێیان رازی بێت ئەگەر لە شوێنێکی دیکەی جگە لەنێو شاری مەدینە بوونایەو بڕیارێکی شەرعیان دەرکردباو ئینجا هاتبانە ناو شاری مەدینەو بیانزانیبایە، بڕیاری دیکە دەرچووە لەنێو شاردا کە جیاوازە لە بڕیارەکەی ئەوان، ئەگەڕانەوە شوێنی خۆیانو بڕیارەکەی خۆیان راست ئەکردەوە.

بەم جۆرە شاری مەدینە کانگاو سەرچاوەی ئایینو شەریعەتو خانەی فەرموودەو کۆڕو یانەی کۆبوونەوەی زانایان بوو، ئەمە ئەو ژینگەیە بوو کە مالیکی بچوك لە تەمەندا تیایدا لە زانستدا پێگەیشتو فێری زانستە شەرعیەکانو فەرموودە بوو، زانستی زمانی عەرەبی تیایدا خوێند، ئەمەش بەهۆی ئەو کۆششە بەردەوامو دانەبڕاوانەی ئەو بوو لە فێربوونی زانستەکانی شەرع لە هەموو بوارەکاندا هەتاوەکو بوو بە پێشەوای شاری مەدینەی پێغەمبەر (ﷺ)و دوایش بوو بە پێشەوای گەورەترین ژمارەی موسڵمانان.

## ٤- خوێندنی پێشەوا:-

پێشەوا مالیك لە تەمەنی منداڵیدا چووە بەر خوێندنو سەرەڕای بچوکی تەمەنی فێرخوازێکی بە کۆششو بێ هاوتا بوو. ئەم کۆششەشی

ئەو کاتە دەرکەوت، لەوکاتەی باوکی پرسیارێکی لێئەکات‌و مالیکیش نازانێت وەڵامی پرسیارەکەی باوکی بداتەوە، بۆیە باوکی لە بەرامبەر ئەم کەمتەرخەمیەی ئەیترسێنێ‌و ئاگاداری ئەکاتەوە کە دووبارە نەکاتەوە.

پێشەوا مالیك لەبارەی ڕووداوەکەی نێوان خۆیی‌و باوکی ئەڵێت: بابم توڕەبووو هەڕەشەی لێکردم لە بەرامبەر نەزانینی وەڵامی پرسیارەکە، بۆیە حەوت ساڵان بەردەوام لەگەڵ مامۆستا (ابن هرمز) مامەوە بۆ خوێندن.

پێشەوا مالیك هەوڵی ئەدا بە تەنها لای مامۆستاکەی بخوێنێت بۆیی لەکاتی چوونی بۆ لای مامۆستادا، هەندێك خورمای لەگەڵ خۆی ئەبردو ئەیدایە مناڵان‌و پێی ئەوتن هەر کەسێك پرسیاری مامۆستا بکات بڵێ ئیشی هەیە، ئەمەش فێڵێکی گەورەو هەڵسوکەوتێکی باش بوو سەبارەت بە مناڵێکی قوتابی زیرەك بۆ ئەوەی فرسەتی خوێندنی باش وەدەست بهێنێت لەلای (ابن هرمز)دا.

لە زۆر پێگیری‌و حەز لێبوونی پێشەوا مالیك لە خوێندنداو سوود وەرگرتنی لە زانستی مامۆستاکەی، ئەوا زۆر لەبەر دەرگای (ابن هرمز) ئەوەستاو ئەمایەوەو بەردەوام لەبەردەم دەرگای مامۆستاکەی هاتوچۆی ئەکرد تاوەکو جوڵەو دەنگێك لە نزیك دەرگاکەیان دروست بکات‌و مامۆستاکەشی بیبیستێ، ئینجا کوڕی هرمز ئەیوتە کەنیزەکەی: کێیە لەبەر دەرگادا؟ کەنیزەکەش ئەچوو دەرگایەکەی ئەکردەوەو ئینجا ئەگەڕایەوەو ئەیووت: ئەوە (مالیك)ە، کوڕی هرمز بە کەنیزەکەی ئەووت:

((لێی گەڕێ بابێتە ژوورەوە، ئەمە زانای خەڵکە)).

ئەمە دان پیانانو بڕوانامەیەکی گەورەیە لەلایەن مامۆستاکەی (لە کاتێکدا هێشتان تەمەنی بچوك بوو)و گەواهی ئەدا کە ئەبێتە زانایەکی پایە بەرزو پێشەوای خەڵکی، ئەم دان پیانانە لە زمانی (ابن هرمز)ەوە بوو چونکە بە قوتابییەکی زۆر باشی دائەناو چاوەڕێی دوارۆژێکی گەشاوەو روونی لێئەکرد.

لەو شتانەی بەڵگەن لەسەر پێگیری پێشەوا بۆ خوێندن ئەچووە لای نافع خزمەتکاری عبداللەی کوڕی عمر، و ئەیویست فێڵێك بدۆزێتەوە تاوەکو فرسەتێکی دەست بکەوێت بۆ ئەوەی لەلای ئەو بخوێنێت. بۆیە ماوەیەکی زۆر لەبەر رۆژ ئەمایەوە بێ ئەوەی هیچ شتێك لە گەرمای تیشکی رۆژبیپارێزێت، ئەمایەوە تاوەکو نافع دەرئەکەوت، ئینجا مالیك شوێنی ئەکەوتو کاتێك فرسەتی بۆ هەڵئەکەوت پرسیاری زانستی لێئەکردو لەلای ئەخوێند.

مالیك خوشکێکی هەبوو، ئەم خوشکەی ئەیبینی مالیك بۆ ماوەیەکی زۆر لەبەر تیشکی گەرمای رۆژ ئەمایەوەو چاوەڕێی هاتنەدەری مامۆستاکەی ئەکات تاوەکو لەلای بخوێنێت، بۆیە زگی بۆی سوتاو رۆژێکیان بە باوکی ووت، ئینجا باوکی پێی ووت: ئەی کچم مالیك فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەخوێنێتو دەرخی ئەکات.

بەهەمان شێوە لەزۆر پێگیری مالیك بوو، لە پێناو فێربوونی زانستو زانیاریدا چاوەڕێی رۆژی جەژنی ئەکردو ئینجا ئەچووە خزمەت

مامۆستاکەی‌و زانستی لەلا نەخوێند. چونکە لەم رۆژەدا خەڵك خەریکی رۆژی جەژن بوون‌و تیایدا زانستیان نەنەخوێندو بەمەش کەش‌و هەوایەکی ئارام‌و تەنها بۆ پێشەوا مالیك نەڕەخسا تاوەکو بە درێژایی ئەو رۆژە خەریکی خوێندن بێت لەلای مامۆستاکەی بێ ئەوەی کەسێك هەبێت کاتەکەی لێبگرێت.

پێشەوا مالیك باسی خوێندنی رۆژی جەژنمان بۆ ئەکات‌و ئەڵێت: رۆژی جەژن هات‌و منیش ووتم: ئەمڕۆ مامۆستاکەم ئیبن شهاب کەسی لەلا نییەو بە تەنهایە، دوای ئەوەی نوێژ کراو چوومە بەر دەرگای ماڵەوەیان‌و دانیشتم، گوێم لێبوو بە کەنیزەکەی خۆی وت: بڕۆ تەماشاکە بکە بزانە کێ لەبەر دەرگایە؟ هات تەماشای کردو بیستم ئەیووت: مالیکی قوتابییە. ئیبن شهابیش ووتی: بابێتە ژوورەوە. منیش هاتمە ژوورەوە، ئینجا ووتی: بۆچی ئەچوویتەوە ماڵەوەت؟ وەکو ئەوە وابوو بەشێوەیەکی بەرێزەوە بڵێت: ئەمڕۆ بۆچی هاتووی لە کاتێکدا رۆژی جەژنە؟ ووتم: بە بۆنەی رۆژی جەژنەوە نییە، ووتی: هیچت خواردووە؟ ووتم: نەخێر. ئایا خواردن ئەخۆی؟ ووتم: پێویستم پێی نییە. ووتی: ئەی چ ئیشێکت هەیە؟ ووتم: فەرموودەم فێر بکە. پێی ووتم: بڵێ، ئینجا منیش لەوحەکانم هێنایە، دەرەوەو ئەویش چل فەرموودەی فێرکردم‌و پێم ووت: زیاترم پێ بڵێ. ووتی: ئەمە بەستە، چونکە ئەگەر تۆ بە تەواوی ئەم فەرموودانە بزانی‌و بتوانی بیانگێڕیەوە، ئەوا لە فەرموودە زانەکانی، ووتم: ئەیانزانم. ئینجا لەوحەکانی لێ وەرگرتم‌و پاشان ووتی: فەرموودەکان بڵێوە، منیش

فەرموودەكانم بۆ گوتەوە، ئینجا لەوحەكانی پێدامەوەو ووتی: هەستە بەڕاستی تۆ گەنجینەی زانستی.

ئەم هەموو بەردەوامی خوێندنە لە پێشەوا مالیكەوە بوو، بەشێوەیەكی چالاكانەو ماندوونەناسانەو خۆشییەوەو بە یاریدەی بیر تیژییەكەی زانستەكەی ئەخوێند.

بۆیە رۆڵە خۆشەویستەكانم پێویستە لەسەرمان تێبكۆشین بۆ فێربوونی زانستو بیرو مێشكمان تەنها بە زانستەوە خەریك بكەینو شوێن هەنگاوەكانی پێشەوا مالیك بكەوین تاوەكو پلەو پایەمان لە دونیاو دوارۆژدا بەرزبێتەوە.

بشزانن فریشتەكان باڵی خۆیان بۆ فێرخوازان رائەخەنو رازین لەسەر فێربوونی زانستیان.

## ٥- رابەرو مامۆستاكانی:-

پێشەوا مالیك لە خزمەت زۆرێك مامۆستای سەردەمەكەی خۆی خوێندووە، ئەوەی بۆ پێشەوا هەڵكەوتووە لە رەخسانی هەلو ماوە بۆ ئەوەی لەلای مامۆستاو رابەرە ناوازەو بلیمەتەكان بخوێنێت بۆ هیچ كەسێك لە سەردەمەكەی ئەودا بەم شێوە باش رێكنەكەوتووە. گەیشتووە بە سێ سەد زانا لەشوێنكەوتوان، هەروەها لە شوێنكەوتووی شوێنكەوتووانیش (تابعی تابعین) گەیشتووە بە شەش سەد زانا، ئەوانەی هەڵبژاردوون كە ناسراون بە ئایینداری شارەزاو زانا بە ئایین. ئێمە توانای

ئەوەمان نییە هەموو مامۆستاکانی پێشەوا باس بکەین بەڵام هەندێکیان وەکو نموونە باس ئەکەین:

## ١- ربيعة الراي:

ربيعة الرأي یەکەم مامۆستا بوو کە پێشەوا مالیك چووە خزمەتیو زانستی لەلا خوێند، ناوی تەواوی ربیعە کوڕی باوکی عبدالرحمن فروخ (تیمی)ە، بەهەندێك لە گەورە هاوڕێیان (صەحابەکان)و شوێنکەوتووەکانی (تابعین) گەیشتووە، خاوەن فەتواو بڕیاری شەرعی بوو لە شاری مەدینە، جێگەی متمانەو فەرموودەناسی بوو، پێشەوا مالیك زۆر ڕێزی مامۆستایەکەی ئەگرتو لە دانیشتنەکانیدا قسەی نەئەکردو هەر کاتێك مامۆستاکەی پرسیاری بکردبایە دەستپێشخەری نەئەکرد. ئەگەر دەسەڵاتداران بانگیان بکردبایە، نەئەچوو تاوەکو راوێژی بە مامۆستاکەی (ڕەبیعە) نەکردبایە، تاوەکو پێشەوا مۆڵەتی لە مامۆستاکەی وەرنەگرت دانەنیشت بۆ ئەوەی بڕیارو فەتوای شەرعی دەربکات، بەشێوەیەك بوو، تاوەکو جارێکیان ووتی: لەو کاتەی ڕەبیعەی کوڕی باوکی عبدالرحمن کۆچی دوایی کردووە هیچ خۆشیەك لە زانستی شەریعەتدا نەماوە، خێرو بەرەکەتێکی زۆرو ژیریەکی ڕەسەنو زمانێکی پاراوو ڕێزێکی ئاشکراو شێوازێکی چاك لە ئیسلامو خۆشەویستیەکی راستەقینەی هەبوو بۆ برایەکانی.

## ٢- عبداللهی کوڕی هرمز:

ئیبن هرمز دووەم مامۆستاو ڕابەر بوو کە پێشەوا مالیك زانستی لەلا خوێند بێت، ناوی تەواوی عبدالرحمن کوڕی هرمز (الاعرج) ئەبو داودی مدنی بوو، خزمەتکاری ربیعەی حارث کوڕی عبدالمطلب بوو، لە شوێنکەوتووان (تابعین) بوو، فەرموودەی لە زۆر لە هاوڕێ (صەحابە) گەورەکانی وەك ئەبو هریرەو ئەبو سەعیدو ئیبن عباسو معاویەی کوڕی سفیان گێڕاوەتەوە.

پێشەوا مالیك حەوت ساڵ یان زیاتر زانستی لە ئیبن هرمز وەرگرتووە، ئیبن هرمز زانایەکی بە توانا بوو بە سوننەت چ لە ڕووی ووتە یان کارکردن یان جێبەجێ کردنەوە بێت، سەرەڕای بەرزی پلەو پایەی زانستی بەڵام بەخێرایی بڕیاری شەرعی دەرنەدەکرد، هەوڵی نەئەدا وا خۆ دەربخات کە ئەو شایانی ئەوەیە سەرۆکایەتی زانستو بڕیار (فەتوا) دانی شەرعی بگرێتە دەست، هەروەك هەندێك لە زانایانی ئەم سەردەمە هەوڵی بۆ ئەدەن، بەڵام ئەگەر هاتوو پرسیارێکی زانستی شەرعی لێکرابایە، زۆر بیری لێئەکردەوە پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە. پێشەوا مالیك زۆر کاریگەر بوو بە ئیبن هرمز لە ڕووی زانست شەرع زانینەکەی.

ئیبن هرمز لە ساڵی (١٤٨)ی کۆچیو لە شاری مەدینەدا لە تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵی کۆچی دوایی کرد.

## ٣- نافع دەیلەمی:

نافع سێیەم مامۆستا بوو کە پێشەوا مالیك زانستی لەلا خوێندبێ، ناوی تەواوی نافع کوڕی سرجیس‌و نازناوی ئەبو عبداللە دیلمی بوو، خزمەتکاری عبداللە کوڕی عمر بوو. بێ فیزو کەم دوو بوو.

نافع لە عبداللەی کوڕی عمر فێرە زانست، و شارەزایی لە ئایینیدا پەیداکرد بوو. نافع لەو کەسە زیرەکانە بوو زۆر بەباشی فەرموودەی دەرخ کردبوو. نازناوی فەقیهی (شارەزای) مەدینەو پێشەوای زانستیان لێنابوو، ئیبن شهاب لەلای نافع فەرموودەی خوێندووە.

مالیك زانستی فیقهو فەرموودەی لەلای نافع خوێندووەو سودی لێوەرگرتووەو فەرموودەکانی ئیبن عمری لێ وەرگرتووەو لێی فێربووە. مالیك زۆر متمانەی بە نافع هەبووەو ئەیوت: ئەگەر فەرموودەم لە نافع گوێ لێبێت کە ئەویش لە ئیبن عمر گێڕاویتیەوە، ئەوا پێویستم بە هیچ کەسی دیکە نییە تاوەکو لەبارەی ئەم فەرموودەیە لەلای ئەودا خۆمی لێ دڵنیا بکەمەوە، بۆیە فەرموودەناسان ووتویانە: دروستترین فەرموودە ئەوەیە مالیك گێڕابیتیەوە، ئەویش لە نافع ئەویش لە ئیبن عمر گێڕابیتیانەوە. هەر کاتێکیش شافعی لەم زنجیرەیە فەرموودەی گێڕابیتەوە پێی ئەوترێت زنجیرەی زێڕین (سلسلة الذهب).

مالیك ئەیووت: لە نیوەی رۆژو کاتی گەرما ئەچوومە خزمەت نافع بۆ ئەوەی لە رێگادا سێبەرێك هەبێت، و هەرکاتێك چاوم بە نافع ئەکەوت وام ئەزانی پێشتر نەمبینیووە، دوایی سەلامم لێئەکردو دوای ئەوەی

نەچووە ماڵی خۆیانو پێم نەووت، ئیبنو عمر لەبارەی ئـەو بابەتـەوە چـی ووتوە: وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوەو فێرە فەرموودەی نەکردم.

مالیك هەموو کات نافیعی لـە ماڵەکـەی واتـە مـاڵی نـافع نـەبردە مزگەوتو دەستی نەگرت، چونکە رۆشنایی چاوەکانی نەمابوو، بینینی لە دەست دابوو، و پرسیاری لێنەکردو نافیعیش فەرموودەی بـۆ نەگێڕایـەوە، ماڵی نافیعیش لە نزیك (بەقیع) بوو.

نافع (بەرمیهرەبانی خوای گەورە بکەوێت)، لە ساڵی (١١٧)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە.

## ٤- ئیبنو شهاب زهری:

هەروەها پێشەوا مالیك لەلای محمد کوڕی مسلم کوڕی عبیدالله کوڕی شهاب زهری قرشی ئەبوبـەکر، خوێندوویـەتی، ئـەو کەسـەی توانایـەکی بـەهێزو بـێ وێنـەی هـەبوو لـە دەرخ کردنـداو هـەرگیز شـتی لـە بـیر نەئەچووەوە. زانایان لەبارەیان ووتویانەوە: هیچ کەسێکی وەکو ئەو نەماوە کە زاناتر بێت لە ئیبنو شهاب لەبارەی بنەچەکەو رابردووەوە.

مالیك ئەڵێت: ئێمە فێرخوازانێکی زۆر بـووین کـە ئەچـووینە مـاڵی ئیبنو شهابو بە پاڵەپەستۆ بەسەر پلەکانی ماڵەکەیانـدا سـەر ئەکـەوتین تـاوەکو هەنـدێکمان بەسـەر هەنـدێکمان دائەکـەوتین. هـەروەها ووتـی: ئەچووینە ماڵی ئیبن شهاب کە لە (بنی الدیل) بو، بەردەرگایەکی جـوانی هەبوو هەمووجار لەسەری دائەنیشتینو هەوڵمان ئەدا تاوەکو زوو بگەینـە

ئەوێ.

مالیك هەندێك زانستی (حكمة-فەلسەفە)ی لەلای مامۆستاكەی خوێندووە...

زهری سەرنجی هەموویانی بۆ لای خۆی راكێشابوو، هەتا بەشێوەیەك بوو كە جێنشین عمر عبدالعزیز نووسیبوی ((ئاگاداری ئیبن شهاب بن‌و رێزی لێ بگرن، چونكە یەكێكی وەكو ئەو نادۆزنەوە كە زاناتر بێت لە مێژووو زانستی رابردوودا)).

زهری توانایەكی بەهێزی خوێندنەوەی هەبوو بۆیە بەردەوام ئاگادار بوو بەسەر زانستەكان، پەرتوكخانەیەكی لەماڵەوە هەبوو، پەرتوكی زۆر ئەخوێندەوە، رۆژانە زیاتر بە پەرتوكەكانییەوە خەریك بوو دوای ئەوەی وانەی بە فێرخوازان ئەووتەوە لەو رووداوە سەیرانەی سەبارەت بە خوێندەوەی زۆرو فەرامۆشكردنی كارەكانی دونیا، ئەگێڕنەوە لەبەرئەوەوی زهری بەردەوام پەرتوكی ئەخوێندەوە، خێزانەكەی پێی ناخۆش ئەبێت‌و رۆژێكیان پێی ئەڵێت: سوێند بە خوا ئەم پەرتوكانە بۆ من ناخۆشترە لە سێ هەوێ، واتە ئەگەر مێردەكەی سێ ژنی دیكەی هەبێت هێشتا پەرتوكەكانی لەلا ناخۆشترە، چونكە هەموو كاتی مێردەكە ئەبەن، بۆیە زهری خاوەن رۆشنبیریەكی زۆرو بەرزبوو، لە هەموو خەڵكیش زاناتر بوو سەبارەت بە زانستی بنەچەناسی (علم الانساب)دا. لە ساڵی (١٢٤)ی كۆچی، لە شاری (شغب)ی سەر سنووری فەلەستین كۆچی دوایی كردووە.

## ٥- جعفر الصادق:

هەروەها لەو مامۆستاو رابەرە ناوازانەی پێشەوا مالیك زانستی لێوەرگرتوونو خوێندوویەتی لەلایان، پێشەوا جعفر کوڕی محمد کوڕی علی کوڕی حسین ناسراو بە (جعفر صادق). و سەرۆکی ئالی بەیت بوو لە شاری مەدینە.

پێشەوا جعفر بەشێوەیەك خاوەن زانستو تەقواو رێزو لێبوردە بوو کە کەس پێشی نەئەکەوتەوە. زانایەکی هەڵکەوتووبوو، دانایەکی بێ هاوتاو وێژەزانێکی بە تواناو زاهدو خواپەرستێکی بێ وێنەبوو، میانڕەو بوو لە هەموو شتێکداو کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی بوو.

پێشەوا جعفر شایەنی رێزو ستایش کردن بوو، ووتەکانی جەخت لەسەر بەرزی ئەم پێشەوایە ئەکەنەوە، لە ووتەکانی دایە، ئەڵێت: خوای گەورە شتێکی بەهۆی ئێمەوە ئەوێت، و شتێکیشی لە ئێمەوە ئەوێت، ئەوەی بەهۆی ئێمەوە ئەیوێت لەبەرچاوان شاردوویەتیەوە، ئەوەش کە لە ئێمەوە ئەیوێت دەریخستووەو ئاشکرای کردووە، کەوابوو بۆچی خۆمان خەریك ناکەین بەو شتەی خوای گەورە بۆ ئێمەی روونکردۆتەوە.

پێشەوا جعفر بە شێوازە دەربڕینێك لە خوا ئەپاڕێتەوە، لە ئەوپەڕی رەوانی زمانو ئەوپەڕی خواپەرستی دابوو، ئەپاڕایەوە لە خوای گەورەو ئەیوت: ئەی خوایە سوپاس بۆ تۆ ئەگەر پەرستنی تۆم ئەنجام دابێتو شوێن فەرمانەکانت کەوتبم، بەڵگەشت بەدەستە ئەگەر بێ فەرمانی تۆم کردبێت، ئەمنو ئەهیچ کەسێك دەسەڵاتی چاکەکردنی نییە، ئەمنو

نەهیچ کەسێك بەڵگەی گونجاوو شیاومان پێ نییە لەوەی بۆچی خەراپەمان ئەنجام داوە.

پێشەوا مالیك هاوڕێیەتی پێشەوا جعفری کردووەو زانستی لەلا خوێندووە.

پێشەوا مالیك لەبارەی پێشەوا جعفر ئەدوێت‌و ئەڵێت: جعفر کوڕی محمد زۆر بە زەردەخەنە بوو، هەر کاتێکیش باسی پێغەمبەری (ﷺ) لەلا کردبایە ئەوا ڕەنگی زەرد هەڵئەگەڕا. زۆر جاران لەکاتە جیاوازەکاندا سەردانم کردووە، تەنها بە سێ شێواز بینیومە: یا خەریکی ئەنجامدانی نوێژ بووە یاخود بە ڕۆژوو بووە، یان قورئانی ئەخوێند. بەردەوام بە دەستنوێژەوە باسی پێغەمبەری (ﷺ) کردووە، باسی شتێکی نەئەکرد کە پەیوەندی پێوە نەبووایە. لەو زاناو خواپەرست‌و زاهیدانە بوو کە لە خوا ئەترسا. هەرکاتێکیش سەردانم کردبێت ئەوا بەرماڵی ژێرە خۆی (تایبەتییەکەی) بۆ من ڕاخستووە.

پێشەوا مالیك زۆر کاریگەر بوو بەپێشەوا جعفر صادق،و سوودی زۆری بینیبو لە رووی فەرموودەو زانستەکانی دیکەوە.

هەروەها پێشەوا قوتابی زۆرێك لە مامۆستا پایەدارەکانی دیکە بووە، بواری ئەوەمان نییە باسی هەموویان بکەین، بۆیە بەو ئەندازەیە کۆتایی بە باس کردنی مامۆستاو رابەرەکانی دێنین.

پێشەوا جعفر صادق ڕەحمەتی خوای لێبێت لە ساڵی (١٤٨)ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە.

## ٦- پێشەوا مالیكو فەرموودەی پێغەمبەر:-

ئەوەی گومانی تێدانییە ئەوەیە: فەرموودەناس (محدث) ئەو كاتە فەرموودەناسە كە فەرموودەكانی لەبەر بێت، ناشتوانێت لەبەریان بكات تاوەكو خاوەنی یادەوەریەكی خێراو بەهێزی نەبێت بۆ لەبەركردن. زانایانی پێشین پشتیان بە لەبەركردن ئەبەست، هەتاوەكو نووسینەوەی زانست برەوی پەیداكرد، ئینجا فەرموودەناسان پشتیان بە لەبەركردنو نووسینەوەی فەرموودەكان یاخود هەر زانستێكی دیكە بەست.

پێشەوا مالیكیش رەحمەتی خوای لێبێت بەهێزترین یادەوەری هەبوو بۆ لەبەركردن لەنێو خەڵكدا. فەرموودەكانی پێغەمبەری (ﷺ) لەبەركردووەو گرنگو بایەخی تەواوی پێداوە، تاوەكو لەم بوارەدا بووە پێشەوای خەڵك. سەنەدو بیروڕاكانی دروستترین سەنەدو بیروڕا بوون لەلای زانایانی شەرعو سوننەت، زانایان لەبارەی (مالیك)ەوە. ئەڵێن: كە متمانە پێكراوێكی بێ وێنەو دادگەرێكی بێ هاوتاو ووردبینێكی بە تواناو هەڵەچنێكی لێهاتووبوو لەبارەی هەڵبژاردنی ئەو كەسانەی فەرموودەیان بۆ ئەگێڕایەوە. هیچ زانایەك نەیتوانییە لەبارەی سەنەدەوە رەخنە لە پێشەوا مالیك بگرێت.

پێشەوا مالیك -رەزای خوای لێبێت- ((ئەگەر بچوكترین گومانی لە فەرموودەیەكدا لەهەر روویەكەوە بێت لێبكردبایە، ئەوا وازی لێئەهێنا)).

كارەكە وەها ئاسان نەبوو تاوەكو مالیك بەم پایەیە بگات، بەڵكو ماندووبوونی زۆری چەشتووەو شەوخونی زۆری بینیوەو ئارام گرتنو

لێبوردەیی‌و ووردبینی‌و تێکۆشانێکی بێ هاوتای ئەنجام داوە تا گەیشتووە بەم پایە بەرزەی زانست‌و پیشەوایەتی.

مالیك زۆر ڕێزی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگرت، بە ئەندازەیەك تاوەکو خۆی نەشۆردبایەو بۆنی خۆشی لەخۆ نەدابایەو پۆشاکی تازەی نەپۆشیبا ئەوا فەرموودەی نەئەگێڕایەوە. عەمامەی لەسەر دائەناو بە خشوع‌و ملکەچی فەرموودەکانی ئەووت، وەك ڕێز گرتن و بە گەورە زانینی فەرموودەکان بوو. ڕۆژێکیان لەکاتی گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دووپشکێك پێوەی ئەدا، بەرگەی ئازارەکەی گرت‌و وازی لە گێڕانەوەی فەرموودەکە نەهێنا، دوای ئەوەی پرسیاری ئەمەیان لێکرد، ووتی: ئەمە بەهۆی دەربڕینی ڕێزو گەورەیی بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.

لەبەر زۆری بە گەورە دانان‌و ڕێزگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەنگ بەرزکردنەوەی لەکاتی وانەکانی فەرموودەدا بە کارێکی ناپەسەند دائەناو موسڵمانانی قەدەغە ئەکرد لەوەی دەنگیان بەرزبکەنەوە لەکاتی ووتن‌و گێڕانەوەی فەرموودەداو بەم ئایەتەش بەڵگەی ئەهێنایەوە: (یاأیها الذین امنوا لاترفعوا اصواتکم فوق صوت النبي/ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەر (ﷺ) بەرز مەکەنەوە لەکاتی گفتوگۆدا) (الحجرات- ٢- تەفسیری ئاسان).

جا هەر کەسێك دەنگی بەرز بکات لەکاتی گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەکو ئەوە وایە دەنگی لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بەرز بکردبێتەوە.

## ٧- كۆڕە زانستیەکەی:-

پێشەوا مالیك بەرێزو ئارامیو ویقارەوە دانیشت بۆ ووتنەوەی زانستە شەرعیەکان، ئارامیو بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر دانیشتنەکانیدا، خاوەن رەوشتو یاسای جوانو زانستی زۆر بوو.

پێشەوا مالیك - رەزای خوای لێبێت- زاناو پێشەوایەکی خانەدان بوو ژاوەژاوو دەنگ بەرزکردنەوەو دووڕوویی تێدا نەبوو. سەرەڕای ئەوەی کۆڕەکانی لەنێو مزگەوتی مەدینەدا بوو بۆ خۆشی هێشتا نۆزدە ساڵان بوو، بەڵام کۆڕە زانستیەکانی گەورەتر بوو لە کۆڕە زانستیەکانی (نافع)ی مامۆستای.

پێشەوا مالیك خێرای نەکردووە لەوەی لە تەمەنێکی زۆر زوودا کۆڕی زانستی ببەستێتو خەڵکی فێرە زانستە شەرعیەکان بکات، و بەشێوەیەکی ناشایستەو (شایان نەبوو) دانەنیشتووە، بەڵکو بەهۆی هەبوونی شارەزاییو زانستێکی زۆربوو لەم بوارەدا، و دوای ئەوەی حەفتا زانای متمانە پێکراوی دادگەر گەواهیان بۆدا لەوەی شایەنی ئەوەیە کۆڕ ببەستێتو قوتابیان فێرە زانست بکات و بڕیارو فەتواش بۆ خەڵك دەربکات، ئینجا دوای ئەمانە کۆڕی تایبەتی خۆی بەستووەو فێرخوازانی فێرە زانست کردووە.

لەو کارانەی جێگەی سەرنجدانو گرنگی پێدان بوو، پێشەوا مالیك لەبەر زیرەکیو زانست زۆرییەکەی دوو لە مامۆستاو رابەرەکانی، مالیك کە لەکاتی منداڵیدا لەلای ئەوان ئەیخوێند، ئامادەی کۆڕە زانستیەکانی

ئەبوون ئەوانیش یحی ئەنصاری‌و محمد بن مسلم زهری بوون، و ئامادەی کۆڕە زانستیەکانی مالیك ئەبوون‌و گوێیان لێ ئەگرت‌و لێیەوە فێر ئەبوون.

پێشەوا مالیك هەمان ئەو شوێنەی لەناو مزگەوتدا بۆ خۆی دەست نیشان کردبوو، کە عمر کوڕی خطاب (ڕەزای خوای لێبێت) لێی دائەنیشت کە هەمان ئەو شوێنە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی دائەنیشت. هەروەها زۆر پێگیربوو لەوەی لە زۆر کاروباردا وەکو عمر کوڕی خەتاب هەڵسوکەوت بکات‌و لەو بچێت. پێشەوا مالیك بەردەوام بوو لەسەر ووتنەوەی وانەکانی لەنێو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) تا ئەو کاتەی تووشی نەخۆشی (میزە چۆڕکێ) بوو، بۆیە وانەو دانیشتنەکانی لە مزگەوتەوە گواستەوە ماڵەوە. کە لە خانووی عبدالله کوڕی مسعود (ڕەزای خوای لێبێت) بەشێوەی کرێچی تیایدا نیشتەجێ بوو، دوای ئەوەی تووش بوو بە نەخۆشیەکە زەحمەت بوو لەسەری بەردەوام بێت لە چوونە دەرەوە بۆلای خەڵك.

لەو ڕەوشتە بەرزانەی پێشەوا (ڕەزای خوای لێبێت) هەیبوو، نەخۆشیەکەی شاردەوە لای خەڵك‌و بۆی باس نەکردن تا کۆتایی ژیانی، ئینجا ووتی: ((ئەگەر هاتوو لە کۆتایی ژیان نەبوویام، هەواڵی نەخۆشی (میزە چۆڕکێ)ی خۆمم پێ نەئەوتن، پێم ناخۆش بوو بەبێ دەست نوێژی بێمە ناو مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها وە پێشم ناخۆش بوو باسی

نەخۆشـــیەکەم بکـــەمو ئینجـــا ســـکاڵای نەخۆشـــیەکە بکـــەم لـــەلای پەروەردگارم)).

لـەو شـتانەی فرسـەتی بـۆ پێـشەوا مالیـك دروسـت کردبـوو لـە بڵاوکردنەوەی ئەو زانستەی لەلای هەبوو، هاتنی هەمیـشەیی موسـڵمانان بوو، بۆ سـەردانی مزگـەوتی پێغەمبـەر (ﷺ). ئینجـا پێـشەوا (ڕەزای خوای لێبێـت) گـوێی لـە ڕووداوی ژیانیـان ئـەگرتو شـارەزا ئـەبوو بـە کێـشەکەیان ئینجـا دوای ئەمـە حـوکمو بڕیـاری گونجـاوو لـەباری بـۆ کێشەکەیانی (لـەژێر ڕۆشـنایی شـارەزاییەکەی بـە قورئـانو فـەرموودەو زانستەکانی دیکە) بۆ دەرئەکردن.

موسڵمانان لەبەر بەرزی پلەوپایەی زانـستیو بـاڵا دەسـتی تیایـدا، و ناوبانگی گەورەی لە نێوان خەڵکیدا، بە تامەزرۆییەوە ئەچـوونە خزمـەت کۆڕە زانستیەکەیو بە حەزو ویستێکی زۆرو گوێڕایەڵیەکی تەواوەوە گوێ بیـستی وانـەکانی ئـەبوونو فەرمایـشتەکانی پێـشەوایان لەبەرئـەکرد کاتێکیش ئەگەڕانەوە ئەو شوێنەی لێیەوە هاتبوون، خەڵکیان فێـری ئـەو زانستە ئەکرد کە لە پێشەوا مالیك فێربووبوونو لەبەریان کردبوو.

بەم جۆرە زانستی پێشەوا مالیك (ڕەزای خـوای لێبێـت) لـە هـەموو شوێنێك بڵاوبوویەوە، تاوەکو بووە پێشەوایەکی دیـارو بەرچـاوو خـاوەنی ڕێبازی تایبەتی خۆی بوو، لـە هـەموو کـاتو سـەردەمێکدا ڕێبازەکـەی لەلایەن فێرخوازانەوە ئەخوێندرا.

## ٨- قوتابییەکانی پێشەوا:-

زۆربەی ئەو زاناو پێشەوایانەی لە سەردەمی پێشەوا مالیك دا بوون، قوتابی پێشەوا بوون، قوتابییەکانی خەڵکانی نیشتەجێی زۆربەی شوێنەکان بوون، ئەو هۆکارەی یارمەتی ئەوەیدا کە قوتابییەکانی بەم شێوەیەبن، نیشتەجێ بوونی مالیك بوو لە شاری مەدینەی پیرۆز، حاجییەکانی ماڵی خوا (الکعبة) ئەچوونە سەردانی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ)و ئینجا لە کۆڕە زانستیەکەی دائەنیشتنو لێیەوە فێری زانست ئەبوون. قوتابی هەبوو زۆر لە خزمەت پێشەوا مالیك ئەمایەوە، هەشیان بوو ماوەیەکی کەم ئەمایەوە، هۆکارێکی دیکەش لەوەی پێشەوا قوتابییەکی زۆری هەبوون، تەمەن درێژییەکەی بوو، چونکە خوای گەورە تەمەنێکی زۆری پێبەخشی بوو، تەمەنی پیرۆزی گەیشتە نەوەت ساڵ.

## هەندێك لە قوتابییەکانی پێشەوا ئەمانەن:-

### ١- عبدالرحمن کوڕی قاسم:

نازناوی ئەبوعبدالله بوو ناوی تەواویشی عبدالرحمن کوڕی قاسم کوڕی خالد کوڕی جنادە بوو. بیست ساڵ هاوڕێیەتی پێشەوا مالیکی کرد. یەکێك بوو لە قوتابییە دڵسۆزەکانی مالیك، گوێی لە مامۆستاکەی ئەگرتو بەباشی زانستەکانی دەرخ ئەکردو ئامۆژگارییەکانی جێبەجێ ئەکرد. رۆژێکیان پێی ووت: ((لە خوا بترسەو ئەم زانستە بلاو بکەرەوە)). ئیبن قاسم (لەزانستی مالیك دا) زاناترین قوتابییەکانی پێشەوا مالیك و

دڵسۆزترینیان بوو. پیاوێکی زاهیدو لە خواترس و خۆپارێز بوو لە دەسەڵاتداران، و پاداشت و دیاریەکانی ئەوانی وەرنەئەگرت. بەردەوامیش ئەم ووتەیەی دووبارە ئەکردەوە ((نزیك بوونەوە لە دەسەڵاتداران چاکەو خێری تێدانییە)).

دوای ئەوەی پێشەوا مالیك کۆچی دوایی کرد، قوتابییەکانی مالیك سوودی فێربوونی زانستیان لە ئیبن قاسم ئەبینی و لەلای ئەو ئەیانخوێند خاوەنی پەرتوکی (المدونة الکبری)یە لە رێبازی مالیکی داو دیارترین پەرتوکیشە لەم رێبازەدا.

لە راستیدا ئیبن قاسم بەڵگەی زانایی و لێهاتوویی یە لە رێبازی مالیك دا بەشێوەیەك بوو، وەهەبی هاورێی کە درێژترین ماوەی بری بوو لە هاورێیەتی کردنی پێشەوا مالیك دا وەك قوتابییەکەی مالیك دەربارەی ئیبن قاسم ئەڵێت: ((ئەگەر زانستی شەرعیت ئەوێت و مەبەستت بێت لە خزمەت مالیك دا بخوێنی، ئەوا برۆ لای ئیبن قاسم، چونکە خۆی یەکلاکردۆتەوە بۆ زانستی شەرعی بەڵام ئێمە بە شتی دیکەوە خەریك بووین)).

ئیبن قاسم لە میسرو لە مانگی (صفر)ی ساڵی (١٩١)ی کۆچی و لە تەمەنی نەوەت و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

## ٢- عبدالله کوری وهب:

نازناوی ئەبومحمدو ناوی تەواوی عبدالله کوری وهب کوری مسلم (الفقیه المسلم) لە ناوچەی (فسطاط)ی میسر لە ساڵی (١٢٥)ی کۆچی لە

دایك بووه. زیاتر لە بیست ساڵ لە خزمەت پێشەوا مالیك دا ماوەتەوە، هەموو ژیانی لە پێناو فێربوونی زانستدا خەرج کردووە.

پێشەوا سفیان کوڕی عینیە نازناوی ڕابەر (شیخ)ی ئەهلی میسری لێنابوو. ئیبن وهب لای زانایانی میسرو حجازو عێراق خوێندوویەتی، ئەڵێن ئەو مامۆستاو زانایانەی ئیبنو وهب زانستی لێیان وەرگرتووەو فێربووە، زیاتر بوون لە چوارسەد مامۆستا.

تەنها ئەوە هەیە زیاتر لە خزمەت پێشەوا مالیك ماوەتەوەو لەبەردەستی ئەودا بۆتە زانایەکی هەڵکەوتوو.

پێشەوا مالیکی، خۆشەویستو ڕێزی ئەگرت، بەشێوەیەك بوو هەتا ئەڵێن: هیچ یەکێك رزگاری نەبووە لە ڕەخنەکانی پێشەوا مالیك تەنها ئیبن وهب نەبێت. نازناوی (فقیه-شارەزا-زانا)ی لێنابوو. ڕێگەی پێدابوو وانەکانی بنووسێتەوە، پاشان ڕێگری ئەوەی لێنەئەکرد بەسەری دابچێتەوە. ئیبن وهب یەکێك بوو لە بڵاوکەرەوەی ڕێبازی مالیکی لە میسر چونکە زۆربەی خەڵك توانای گەشتکردنی شاری مەدینەیان نەبوو، بۆیە ئەچوونە خزمەت ئیبن وهبو لێ ی فێرە ڕێبازی مالیکی ئەبوون لە شەریعەتدا. ئیبن وهب ناسراوە بەوەی فەرموودەی زۆری گێڕاوەتەوە. هەر کاتێکیش خەڵك جیاوازی بیروڕایان لەبارەی پێشەوا (مالیك)ەوە لێ پەیدابیبوایە، ئەوا چاوەڕێی هاتنەوەی (ئیبن وهب)یان ئەکرد تاوەکو پرسیاری لێبکەن. کاتێك جێنشین داوا لە ئیبن وهب ئەکات پۆستی دادوەری (قضاء) وەربگرێت لە میسر، رازی نەبوو، خۆی قەدەغەکردو لە

مالّەوە نەهاتە دەرەوە ئینجا کە (رشدين) کوڕی سعد ئەیبینیّو لەو کاتەش ئیبن وهب خەریکی دەست نوێژ شتنە، لە نێو ماڵەکەیدا پێی ئەڵێت: ئایا نایەیتە دەرەوە بۆ ناو خەڵکی تاوەکو دادوەریان بۆ بکەی لەژێر بڕیارەکانی قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ). ئیبن وهبیش سەری بەرز کردەوەوو ووتی: ئایا ژیریەکەت تەنها ئەوەندە بڕ ئەکات؟ ئایا نەتزانیوە زانایان لەگەڵ پێغەمبەران زیندوو ئەکرێنەوە، دادوەرانیش لەگەڵ دەسەڵاتداران زیندوو ئەکرێنەوە؟

ئیبن وهب (ڕەزای خوای لێبێت) لە ساڵی (١٩٧)ی کۆچیو لە تەمەنی حەوتاو دوو ساڵی، کۆچی دوایی کردووە.

## ٣- ئەشهەب کوڕی عبدالعزیز القیسی:

نازناوی ئەبوعەمرو ناوی تەواویشی ئەشهەب کوڕی عبدالعزیز کوڕی داود کوڕی ابراهیمە، و شارەزاو زانای میسر بووە. زاناوشارەزایەکی خاوەن بیروڕای جوانو تێڕوانینی ڕێكو پێك بووە. ئەشهەب لە خزمەت لیث کوڕی سعدو یحیی کوڕی ئەیوب (الغافقی المصری)، و ئیبن لهیعە لە میسر، و سفیان کوڕی عینیە، و فضیل کوڕی عیاض، و پێشەوا مالیك خوێندوویەتی: دوای ئەوەی چووە خزمەت پێشەوا مالیك بۆ ئەوەی لە خزمەتیدا بخوێنی. بووە یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی مالیك. سەربەرزو دڵخۆش بوو بەو زانستەی لە خزمەت پێشەوا مالیك دا خوێندبووی. هەروەها یەکێك بوو لە زانا هەڵکەوتووەکان، ژمارەیەك پەرتوکی بە

نرخی داناوه.

ئەشهەب (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێن لە ساڵی (١٤٠)ی کۆچی لە دایك بووە، هەندێکیش ئەڵێن لەساڵی (١٥٠)ی کۆچییە، هەندێکی تریش ئەڵێن لە ساڵی (١٤٥)ی کۆچی لە دایك بووە. لە ساڵی (٢٠٤)ی کۆچیش لە میسر کۆچی دوایی کردووە.

## ٤- ئەسەد کوڕی فرات:

ناوی ئەسەد کوڕی فرات کوڕی سنانە، بە ڕەسەن خوراسانی بوو، لە کاتێکدا هێشتا لە سکی دایکی دایە، کە دایكو باوکی ئەچنە تونس، ئینجا لە تونس لە دایك ئەبێتو لەوێش پێئەگات. قورئان لەبەر ئەکات. پاشان ئەچێتە خزمەت علی کوڕی زیادو ماوەیەك لەلای ئەو ئەخوێنێتو شارەزا ئەبێت لە زانستەکان، پاشان بەرەو شاری مەدینە گەشت ئەکاتو ئەچێتە خزمەت پێشەوا مالیكو لە زانستەکەی ئەو بەهرەمەند ئەبێت.

پێشەوا شافعی (ڕەزای خوای لێبێت) لەبارەیەوە ئەڵێت: ((کەسێکی وەکو ئەسەدی کوڕی فراتم نەبینیوە، زاناتر بێت لەبارەی جیاوازییەکانی بیرو ڕای خەڵکی)).

لەو کاتەی ئەچێتە میسر پرسیار لە یەکێك لە خواپەرست (زاهد)ەکان ئەکات سەبارەت بە پەرتوکەکانی زانایانی خەڵکی مەدینەو خەڵکی عێراق: ئایا بە کامەیان فەرمانم پێئەکەیت، شوێنی بکەومو فێری ببم؟ ئەویش پێی ووتم: ئەگەر مەبەستت خوای گەورەو ڕۆژی دواییە، ئەوا

شوێن فەرمایشتەکانی مالیك بکەوە.

لە ساڵی (١٨١)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە، خوای گەورە میهرەبانیەکی زۆری لەگەڵ بنوێنێت.

## ٥- عبدالملك کوڕی عبدالعزیز ماجشون:

ناوی عبدالملك کوڕی عبدالعزیز کوڕی عبدالله تەیمی، ئەبومروان مدنی کوڕی ماجشونە. عبدالعزیزی باوکی هاوەدەمی پێشەوا مالیك بوو. (عبدالملك)یش زانایەکی شارەزا (فقیە)ی ڕەوانبێژ بوو، لە پێشەوا مالیك فێری زانست بووە. زانستی لە زۆر شوێنان بڵاوکردۆتەوە زانایانی سەردەمەکەی ڕێزیان گرتووە. لە ساڵی (٢١٢)ی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە (ڕەحمەتی خوای لێبێت).

## ٦- عبدالله کوڕی عبدالحکیم:

نازناوی ئەبو محمد، و ناوی عبدالله کوڕی عبدالحکیم کوڕی اعین کوڕی لیثە، لە خزمەت پێشەوا مالیكو لیث، و بکر کوڕی مضر، و عبدالرزاق، و قعبنی، و ئیبن لهیعە، و ئیبن عینیەی خوێندووە. زاناو شارەزاو متمانە پێکراو داناو نەرمو نیان بووە. زاناترینی هاوڕێیانی پێشەوا مالیك بووە، هاوڕێو هاودەمی پێشەوا شافیعی (ڕەزای خوای لێبێت) بوو، هەر کاتێك لە بەغداد هاتبایە ئەوا سەردانی ئەکرد، ئەویش ڕێزێکی زۆری لێئەگرت. تا ئەمەیە هەڵسوکەوتی زانایانو بانگخوازانی

دڵسۆز بە ئایینی خوای گەورە لە بەرامبەر یەکتریدا.

عبداللە (میهرەبانی خوای گەورەی بەسەردا بڕژێت) لەساڵی (٢١٤ك) کۆچی دوایی کردووە.

## ٧- عثمان کوڕی حکم:

ناوی عثمان کوڕی حکم جزامی، میسری، لە نەوەی (بنی نضرة) لە خزمەت یحیی کوڕی سعید ئەنصاریو موسی کوڕی عقبەو عبدالرحمن کوڕی زیادو جگە لەمانەیش، خوێندوویەتی، هەروەك ئەبو زرارە لیث کوڕی عاصم، حبیب کوڕی سعید خولانی، ئیسحاق کوڕی فراتو جگە لەمانەیش لەلای ئەویان خوێندووە.

یەکەمین کەس بوو، کە ڕێبازی مالیکی لەشەریعەتدا لەمیسر بڵاوکردەوە. زاناو شارەزایەکی ئایینی بە تواناو خواپەرستێکی بێ هاوتابوو. پۆستی دادوەری میسریان پێسپارد بەڵام ڕازی نەبوو. لە ساڵی (١٦٣ك) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کۆچی دوایی کردووە.

## ٨- ئەصبەغ کوڕی فەرەج:

ناوی ئەصبەغ کوڕی فەرەج کوڕی سعید، شارەزاو زانای میسر بوو، بەتایبەت لە شەریعەتدا زۆر لێهاتووو شارەزا بوو. بەرەو مەدینە گەشتی کرد تاوەکو لە خزمەت پێشەوا مالیك بخوێنێت بەڵام ئەو ڕۆژەی گەیشتە نێو شارەکە پێشەوا کۆچی دوایی کرد: ئینجا هاوڕێیەتی قاسمو

ئەشهەبو ئیبن وهبی کرد بۆ خوێندنو فەرموودەی لە خزمەت زهلیو بوخاری خوێندووە. لە ساڵی (٢٢٥ك) کۆچی دوایی کردووە.

## ٩- عبدالملك کوڕی حبیب:

ناوی عبدالملك کوڕی حبیب کوڕی سلیمان کوڕی هارون کوڕی عباس کوڕی مرداس سوللەمی ئەندەلوسی بوو، نازناوی ئەبو مەروان بوو لە ساڵی (٢٠٨)ی کۆچی بەرەو رۆژهەڵات گەشتی کرد، لەلای ئیبن ماجشونو عبداللە کوڕی حکم و(جگە لەمانەیش لە هاوڕێیانی مالیك لەلای ئەوان) خوێندوویەتی پاشان لە ساڵی (٢١٠)ی کۆچی چووە ئەندەلوس. زانایەکی پایە بەرز بوو، فیقهو رێبازی پێشەوا مالیکی لە شەریعەت لەبەرکردبوو. وێژەوانێکی بە توانا بوو، لە شعرو کێشو قافیەو رەوانبێژێکی لێهاتوو بوو. لە ساڵی (٢٩١ك) کۆچی دوایی کردووە.

## ١٠- سەحنون:

نازناوی ئەبو سعید (سحنون)بوو، ناوی تەواوی عبدالسلام کوڕی سعید کوڕی حبیب (تنوخي) بوو، بۆیە نازناوی (سحنون)یان لێنابوو چونکە زۆر وورد بوو لەبارەی وەڵام دانەوەی بابەتە شەرعیەکان. زانایەکی پایە بەرزو خواپەرستێکی دونیا نەویستو راستگۆیەکی دڵسۆز بوو، پێگیر بوو لەسەر هەقو راستی، پشتی لە دونیادا کردبوو، لەبارەی پۆشینی پۆشاكو خواردنی خۆراکدا زۆر سادەبوو، دیاری دەسەڵاتدارانی وەرنەئەگرت. لە

(قەیرەوان) خوێندوویەتی پاشان چووە بۆ میسر ئینجا بۆ مەدینەی پیرۆز، لەلای ئیبن وهبو ئیبن قاسمو ئەشهەب خوێندوویەتی، لەبەر هەژاری فرسەتی ئەوەی بۆ رێك نەكەوت لە خزمەت پێشەوا مالیك بخوێنێت. لەو كاتەی كە پرسیاری ئەوەیان لێكرد بۆچی لە خزمەت پێشەوا مالیك نەتخوێندووە؟ ووتی: لەبەر ئەوەی هەژار بووم، هەروەها ووتیشی: زۆر هەژار بووم ئەگەرنا ئەمتوانی لە خزمەتیدا بخوێنم.

زۆر دڵ ناسكو فرمێسك بە چاوو لە خواترسو بێ فیزو راستگۆو دڵسۆز بوو، زۆر رەقو توندیش بوو لە بەرامبەر خەڵكی بیدعەت كارانو لە رێ دەرچووان.

لەساڵی (٢٣٤ك) داوای لێكرا ببێتە دادوەر رازی نەبوو، بەڵام دوای ئەوەی پێگیربوون لەسەر ئەوەی ئەم پۆستەی پێبسپێرنو بەردەوام بوون لەسەر داواكەیان، پۆستەكەی وەرگرتو بەردەوام بوو تاوەكو لە ساڵی (٢٤٠ك) كۆچی دوایی كرد. ماوەی دادوەریەكەی نەكردبووە سەرچاوەی ژیانیو لێی نەئەخواردو پشتیشی بە دەسەڵاتی سوڵتان نەئەبەست.

جگە لەمانەی باسمان كردن كە لە بەردەستی پێشەوا مالیكدا خوێندوویانەو لە رێبازی مالیكی داو لە شوێنە جیا جیاكانی سەر زەوی بوونەتە زانای دیارو بەرچاو، زۆرێكی دیكەش لە خزمەتی بەهرەمەندبوونو پاشان خزمەتیان كردووە.

ئەمەش بەڵگەیەكی روونو ئاشكرایە لەوەی پێشەوا مالیك (رەحمەتی خوای لێبێت) دڵسۆزو راستگۆو بە كردار بوو لە زانستەكەیو ئیشی بە

زانستەکەی نەکرد بۆیە ڕێبازەکەی ئەو فراوانبوونە زۆرەی بەخۆوە بینیو سەرکەوتوو بوو لە ڕێ ڕوون کردنەوەی خەڵکی.

## ٩- ئامۆژگاریەکانی پێشەوا بۆ دەسەڵاتداران:-

پێشەوا مالیك (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هانی زانایانی ئەدا لەوەی ڕێگەی ڕاست پیشانی دەسەڵاتداران بدەنو قەدەغەیان بکەن لە خراپە کردن. و ئەیووت: ((زانا بۆیە سەردانی دەسەڵاتداران ئەکات تاوەکو ڕێگای ڕاستیان پێ نیشان بدەنو نەیەڵن خراپە بکەن)) ڕۆژێکیان سەردانی هارون ئەکاتو ئامۆژگاری ئەکاتو بیری ئەهێنیتەوە لەوەی عمری کوڕی خطاب، لەکاتی گرانییەکەدا بەخۆی فووی لە ئاگر ئەکردو پاشان ئەیووت: ((خوای گەورە کاتێك لە ئێوە ڕازییە کە ئەو کردەوە ناپەسەندانە نەکەن)). جارێکیان مەهدی جێنشین داوای لە پێشەوا مالیك کرد تاوەکو ئامۆژگاری بکات ئەویش پێی ووت: ((ئامۆژگاریت ئەکەم کە لە خوا بترسێیو بە میهرەبان بیت لەگەڵ خەڵکی شاری پێغەمبەر (ﷺ)و هاوسێیەکانی، چونکە پێمان گەیشتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((شاری مەدینە شوێنی کۆچ کردنمە، گۆڕەکەم هەر لەوێیەو، هەر لەوێش زیندوو ئەبمەوە، خەڵکەکەی هاوسێی منە، بۆیە پێویستە لەسەر گەلەکەم هاوسێیەکانم بپارێزن، جا هەر کەسێك بیانپارێزێت، ئەوا من ئەبمە گەواهی دەریو تکاکاری لە ڕۆژی دواییدا)).

ڕۆژێکیان ئامۆژگاری یەکێك لە دەسەڵاتدارانی کردو پێی ووت:

((ئاگاداری کاروباری خەڵك بەو لەبیریان مەکە، چونکە تۆ لێپرسراوی ئەوانی، لەبەر ئەوەی عمر کوڕی خطاب وتویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر وشترێك لە دەو شاوی فورات بمرێت، ئەوا بڕوام وایە خوای گەورە لەبارەی ئەمەوە لە ڕۆژی دواییدا پرسیارم لێئەکات)).

جارێکیان نامەیەك بۆ یەکێك لە جێنشینەکان ئەنێرێ و تیایدا ئامۆژگاری ئەکات و ئەڵێت: ((بزانە خوای گەورە تۆی تایبەت کردووە بەوەی ئامۆژگاریت بکەم، بەو ئامۆژگاریانەی کە لە پێشدا ئامۆژگاریم پێ کردووی، - تکاوایە- بەهۆیەوە خوای گەورە بەختیاریت بۆ بێنێ و ببێتە هۆکاری چوونە نێو بەهەشت. خوای گەورە لەگەڵ من و تۆ میهرەبانی بنوێنێت، بەهۆی ئەو ئامۆژگاریەی بۆ تۆم نووسیوە و لەگەڵ هەڵسان و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە و ئاگاداربوونی خەڵکانی ژێر دەسەڵاتی خۆت لەوەی کاروبارەکانیان پشت گوێ نەخەیت، چونکە تۆ لێپرسراوی گەورە و بچوکی ئەوانی. پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ((هەموو یەکێکتان شوانن (دەسەڵاتداران) و هەووشتان بەرپرسیارن لەوانەی لەژێر دەسەڵاتی ئێوە دایە)).

ئەگێڕنەوە لە هەندێك فەرموودەدا هاتووە، لە ڕۆژی دواییدا دەسەڵاتدار ئەهێنن کە دەستی بە گەردنیەوە بەستراوە، هیچ شتێکیش ناتوانێ بیکاتەوە تەنها دادگەری نەبێت. عمر کوڕی خطابیش (ڕەزای خوای لێبێت) ئەیووت: سوێند بە خوا ئەگەر بەرخێکی بچوك بزربێ و

بمرێت لە دەم ئاوی فوراتدا، ئەوا باوەڕم وایە خوای گەورە پرسیار لەبارەی لەناچوونی ئەم بەرخەم لێئەکات... کەوابوو ئەو کارانە ئەنجام بدە کە ئەبێتە هۆی نزیك بوونەوەت لە خوای گەورەو رزگارت ئەکات لە ئاگری دۆزەخ، خۆت بۆ ئەو رۆژە ئامادە بکە، کە تەنها کردەوە باشەکانتە رزگارت ئەکەن لەم رۆژە ناخۆشە، چاو لە موسڵمانە باشەکانی پێشین بکەو خواپەرستیو تەقوای خوا زۆر بکە خواپەرستی لە پێش هەموو شتێکەوە دابنێ. لە هەموو کاتێکدا سەیری ئەو ئامۆژگاریانە بکە کە بۆم نووسیوی. پەیمانی لەسەر ببەستەو ئامۆژگاریەکانی ناوی جێبەجێ بکەو هەڵسوکەوتت لەسەری رابهێنە، لە خوا داواکارم سەرکەوتووو سەرفراز بیت.

رۆژێکیان پێشەوا لەلای دەسەڵاتدارێك بوو، یەك لە ئامادەبووان مەدحو ستایشی دەسەڵاتدارەکەی کرد، ئینجا پێشەواش بە دەسەڵاتدارەکەی ووت: ((ئاگاداربە لەوەی لە خۆت بایی ببی بەهۆی ستایش کردنی ئەم خەڵکانە بۆ تۆ، چونکە ئەو کەسەی ستایشت ئەکاتو باسی چاکەیەکت ئەکات کە نەتکردووە نزیکە باسی خراپەیەك بکات لە تۆ کە (تۆ) ئەم خراپەیەت نەکردووە. لە خوا بترسەو تەقوای خوای گەورە بکە لەبەر دوارۆژت، خۆت بپارێزە لە پیاهەڵدانی خەڵکی بۆ تۆ. لە هیچ یەکێك رازی مەبە لەوەی بەرەو ڕوو ستایشت بکەن، چونکە تۆ لەبارەی خۆتەوە شارەزاتری لە ئەوان. چونکە پێیان راگەیاندووم پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) مەدحو ستایشی ئەکات. ئەویش ئەفەرمووێت: ((پشت

یاخود ملتان شکاند، ئەگەر گوێی لێبگرتایە ئەوا سەرفراز نەئەبوو)) وە هەروەها فەرموویشی (ﷺ): ((خۆڵ بکەن بەچاوی ئەوانەی بەرەو روو مەدح‌و ستایشتان ئەکەن)).

پێشەوا مالیك (رەزای خوای لێبێت) راستگۆ بوو لە ووتنی قسەی راست‌و ئازاو چاو نەترسیش بوو لەبارەی راگەیاندنی ئەو ئایینەی باوەڕی پێی هەبوو. جارێکیان هارون رەشید قەدەغەی پێشەوا مالیك ئەکات لەوەی فەرموودەیەکی دیاریکراو بۆ خەڵکی باس بکات، ئەویش رازی نابێت بە فەرمانەکەی‌و پشت گوێ ی ئەخات‌و ئەم ئایەتەی خوای گەورە ئەخوێنێتەوە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾ (البقرة، ١٥٩) بەراستی ئەوانەی کە بەرنامەو رێنموونیەکانی ئاشکرای رەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانن دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان روون کردۆتەوە لە کتێبەکاندا، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەکات‌و نەفرین کارانیش نەفرەتیان لێدەکەن...)) تەفسیری ئاسان).

پێشەوا (خوای لێی رازی بێت) رێزی زانستی زۆر ئەگرت‌و لە بنێ رێزی ئەپاراست، بەڵگەش بۆ ئەمە، جارێکیان هارون رەشید بە شوێنیدا ئەنێری‌و ئەڵێت: ئەی ئەبو عبداللە پێویستە سەردانمان بکەیت‌و پەرتوکی (الموطأ) بۆ منداڵەکانمان بخوێنیەوە، ئەویش وەڵامی دایەوەو ووتی: خوا پایەدارت بکات ئەی ئەمیری بڕواداران، ئەم زانستە لە ئێوەوە هاتووە، ئینجا ئەگەر ئێوە رێزی لێبگرن‌و بە گەورەی سەیر بکەن ئەوا (گەورەو

ڕێزدار) نەبێت، بەڵام ئەگەر ئێوە بێ ڕێزیو نواند لە بەرامبەری ئەوا لە بەرامبەر خەڵکیش (بێ ڕێزو بچوك) ئەبێت، ئەبێ خەڵك بۆ فێربوونی زانست بچێت نەك زانست بۆ ئەوان بچێت. هارون ڕەشیدیش پێی ووت: ڕاست ئەكەیت، پاشان ووتیە منداڵەكانی بڕۆنە مزگەوت تاوەكو لەگەڵ خەڵكی فێرە زانست بن، پێشەوا مالیكش ووتی: بە مەرجی ئەوەی كە هاتنە مزگەوت لە كوێ ڕیزی خەڵك كۆتایی پێهاتبوو ئێوەش لەوێ دابنیشنو بەسەر خەڵكیدا هەنگاو مەنێنو نەچنە ڕیزەكانی پێشەوە. ئینجا هارون ڕەشیدیش بەمە ڕازی بوو.

## ١٠- سەرچاوەكانی شەریعەت (فقه)ی پێشەوا:-

پێشەوا مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) دان پیانراو بوو لەوەی زاناو شارەزایە بە شەرعو فەرموودە، چونكە زاناو شارەزا (شەریعەت زان)و فەرموودەناسی بێ هاوتای شاری مەدینە بوو.

سەرچاوەكانی شەریعەتەكەی ئەمانە بوون:-

یەكەم/ قورئانی پیرۆز: ئەو پەرتوكە ڕاستو دروستەی هەر بەبێ كەمو كوڕی ئەمێنێتەوە، پێشەوا سەرەڕای شارەزابوونی بە فەرموودەو سوننەت ئەوا پشتی بە قورئان ئەبەست لە تێگەیشتنەكانی تاوەكو پاڵپشت بەمانە بڕیاری ڕاستو دروستی شەرعی دەربكات.

دووەم/ سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ): سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دووەم سەرچاوەی شەرعو بڕیارەكانی پێشەوا مالیك بوو. چونكە سوننەتی

پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونکەرەوەی بڕیارەکانی قورئانی پیرۆزو ڕاڤەکەری دەقەکانی بوو، ئەو بابەتو بڕیارانەی نێو قورئانی ڕوون نەکردەوە کە پێویستی بە ڕوونکردنەوەو ڕاڤەکردنیان هەبوو.

پێشەوا مالیك زۆر جاران خەڵکی ئاڕاستە ئەکرد بەرەو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)، تاوەکو سوودو کەڵك لە سوننەتەکەی وەربگرنو بەڵگەشی بەم ئایەتە ئەهێنایەوە: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (الحشر،٧) جا ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پێی بەخشیون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بە گوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێکردن مەیکەن)) تەفسیری ئاسان).
و ئەم فەرموودەیەی خوای گەورەشی بە بەڵگە ئەهێنایەوە ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ (الاحزاب، ٢١) سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواوو ڕێكو پێك هەیە تا چاوی لێبکەنو شوێنی بکەون)) (تەفسیری ئاسان).

بەهەمان شێوە ئەم ئایەتەشی ئەکردە بەڵگە: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾ (النساء، ٦٥) نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕاڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵو دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەك دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە دادوەریت لەسەر کردووەو دەبێت بە تەواوی تەسلیم بنو ڕازی

بن)) (تەفسیری ئاسان).

پێشەوا زۆری سوننەت خۆش ئەویستو بەردەوام ئەم دێرە شعرەی ئەخوێندەوە کە ئەمە ماناکەیەتی:

**باشترین کارەکانی ئایین سوننەتە**

**خراپترین کاریش تازە داهێنراوەکان (بدعة)یە**

سێیەم/ وتەی هاوڕێ (صەحابە)کان: سەرچاوەی سێیەمی ڕێبازی مالیك لە شەریعەتدا وتەی هاوڕێیانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، چونکە هاوڕێیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نزیك بوون، تێکەڵ بوون بە ژیانو هەڵسوکەوتیەوە، کردەوەکانی پێغەمبەریان (ﷺ) بینی بوو، گوێیان لە فەرموودەکانی گرتبوو، لەژێر دەستیدا فێرە ئایینو خواپەرستی بووبوون، کۆچەریەکان (مهاجرون)و پشتیوانان (الانصار) یەکسان بوون لەلای پێشەوا مالیکداو هیچ جیاوازییەکی لە نێوان نەئەکردن.

چوارەم/ یەك دەنگ بوون (الاجماع): یەك دەنگ بوونی زانایانو چوارەم سەرچاوەی ڕێبازی مالیك بوو لە شەریعەتدا، یەك دەنگ بوونیش بریتییە لە یەك دەنگ بوونی زانایانو شارەزایانی ئایین بەبێ جیاوازی لەسەر یەکێك لە بابەتەکانی ئایینی.

پێنجەم/ زانستو زانیاری خەڵکی مەدینە: زانستی خەڵکی مەدینە پێنجەم سەرچاوەی ڕێبازی مالیك بوو لە شەریعەتدا، چونکە خەڵکی مەدینە ڕۆڵەو نەوەی ئەوانە بوون کە هاوڕێیەتی پێغەمبەریان (ﷺ) کردووە، چونکە بڕیارە گشتییەکان چەند نەوەیەك لەو شوێنە بەزیندووی

ئەمێنێتەوە کە لێیەوە دەرچووە. پێشەوا مالیك سەرەڕای ئەمانە هەمووی ئەگەر پێویستی بە دەقێك بووایە یان بە بەڵگەیەکی گشتی بووایە، ئەوا بە پێوانەکردن (قیاس)و بە چاك دانان (استحسان)و (باو) لەناو خەڵکیدا (العرف)و هێنانەدی پێویستیە ناچاریەکان (سد الذرائع)و بەرژەوەندی رەها (المصالح المرسلة)ی بڕیارەکانی دەرئەکرد.

ئەم مەرجانەشی دانا بۆ ئەوەی تاوەکو لە ڕێگەی بەرژەوەندییە رەهاکان (مصالح المرسلة) بڕیاری شەرعی دەربکات:-

١- بەرژەوەندیەکە دژایەتیەکی نەبێت لەگەڵ بنچینەکانی ئیسلام، وە هەروەها لەگەڵ بەڵگەیەکی چەسپێنراویشدا دژایەتی نەبێت.

٢- بەرژەوەندیەکە وەرگیراوبێت لەلای خاوەن ژیرییە تەواوەکان.

٣- کێشەو تەنگو چەڵەمەیەك کۆتایی پێبهێنێت، چونکە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ (الحج، ٧٨)لە ئاینو بەرنامەکەیدا هیچ جۆرە شتێکی نارەواو قورسی لەسەر دانەناون)) -ت. ئاسان.

پێشەوا مالیك سەرەرای ئەمانە وەڵامی خێرای نەئەدایەوە، کاتێك پرسیارێکی لێکردبایە، بەڵکو لێی ئەکۆڵیەوەو پشکنینو بەدوا داچونیشی بۆ ئەکردو ئینجا وەڵامی پرسیارەکەی ئەدایەوە، بۆ ئەوەی وەڵامێکی راستو تەواو بداتە دەست.

## ١١- دانراوەكانی پێشەوا:

پێشەوا مالیك (ڕەزای خوای لێبێت) توانایەكی بەهێزی هەبوو لەسەر پەرتوك دانان، پەرتوكێكی لەبارەی گەردونزانیو، بیركاریو زانینی كاتەكانو شوێنەكانی مانگ دا داناوە، كە زانایان لەبارەی وەسف كردنی ئەم پەرتوكەوە نوسیویانە: پەرتوكێكی زۆر بەسودەو ماوەیەكی درێژ خەڵك پشتیان پێ ئەبەست.

هەروەها لەبارەی ڕاڤەكردنەوە پەرتوكێكی نوسیوە ئەویش پەرتوكی ((التفسیر لغریب القران)) بەهەمان شێوە نامەیەكی نوسیوە بۆ ئیبن وەهب لەبارەی یەكتاپەرستی. لەوانەیە بەناوبانگترین دانراوەكانی پێشەوا پەرتوكی ((الموطأ)) واتە ئاسان، لەبارەی فەرمودە، وە بێت، دروستترین پەرتوكە لەدوای قورئانی پیرۆز.

پەرتوكی ((الموطأ)) یەكەمین پەرتوكە، كە بەچەسپاویو جێگیری بەهی پێشەوا مالیك دائەنرێن، پەرتوكێكی بەناوبانگو بڵاوە لەنێو گەلی موسڵمانو نەوە بەنەوە هاتووە تاوەكو گەیشتوە بەم ڕۆژگارەی ئێمە.

لەهەمان كاتدا بە پەرتوكێكی فەرموودەو شەرع (فقە)ی دائەنێن. خەڵك لەسەردەمانی زوودا زیاتر پشتیان بە لەبەركردنو یادەوەری ئەبەست نەك بەنوسینو پەرتوك. لەفێربوونیش پشتیان بە گوێ لێ ڕاگرتنو پێ گوتن ئەگرت، نەك بەنوسینەوەی زانستو فێربوون لەسەر پەرتوكەكاندا.

دانانو نوسینیی پەرتوك لە پەرتوكی ((الموطأ))وە بەڕاستی دەستی پێكرد. لەسەرەتادا دە هەزار فەرموودە بوو، بەردەوام فەرموودەكانی

بەرامبەر نەکرد بە قورئـانو سـوننەت تـاوەکو پێـنج سـەد فـەرموودەی لێهێشتەوە.

پێشەوا مالیك (رەحمەتی خوای لێبێـت) نـەڵێت: پـەرتوکی (الموطـأ)م پیشانی حەفتا شەرع زانی شاری مەدینە دا، هـەموویان دەسـت خۆشـیان لێکردمویە پەرتوکێکی ئاسانو چـاکیان دانـا، نـاوم لێنـا (الموطـأ) واتـە ئامـادەکراو نوسـراو هەڵبـژێردراو، زانـا گـەورەکان ستایـشی پـەرتوکی (الموطأ)و ئەوەش دەناوی دایە (لە زانستی بەسـودو فـەرمودەی دروسـت) کردوە.شافعی (رەزای خوای لێبێت) ئەڵێت: دوای پەرتوکی خـوای گـەورە (قورئان) لەسەر زەوی دا، پەرتوکی (الموطـأ) راسـترین پەرتوکـە لەسـەر زەوی،

کاتێك پرسیار لە پێشەوا ئەحمەد (رەزای خوای لێبیـت) کـرا لـەبارەی پەرتوکەکەی پێشەوا مالیك، وتی: هـەر کەسـێك شـوێنی بکـەوێت ئـەوا ئاینێکی زۆر دروستی هەیە.

## ١٢- بەڵاو ناخۆشیەکانی پێشەوا:-

پێشەوا مالیك (رەزای خوای لێبێت) لەسەردەمی ئەبو جعفر منـصور توشـی ئـازاردانو لێـدانو نیهانـەکردن بـووە وە، زانایـانی مێـژووی ژیاننامەکەی بیرو رای جیاوازیان لەسـەر ئەمـە هەیـە: هەیانـە- ئـەڵێن: هۆکاری ئازاردانی پێشەوا ووتنی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) کە ئەفەرموێت: (( زۆر لێکراو- بەسەردا سەپێنراو- طلاقی لەسـەر نیـە،

واتە ئازادە نەبەستراوە بەهیچ شتێك (ئایا مارەیی بێت یاخودپەیمان بەستن بێت لەگەڵ سەركردەی موسڵمانان یان هەر شتێكی لەو بابەتانە) (منصور)یش نەی ئەویست باسی ئەم فەرموودەیە بكرێت بۆ خەڵكی، تاوەكو بەگشتیو دوژمنەكانی بەتایبەتی نەیكەن بە بەڵگە لەوەی بەزۆر پەیمانیان لێ وەرگیراوە، بۆیە هیچ پەیمانێكیان لەسەر نیە، ئازادن مادام بەزۆر ئەم پەیمانەیان لێوەرگیراوە، مەنصور رێگری لە پێشەوا مالیك ئەكرد لەوەی باسی ئەم فەرموودەیە بكات- نەوەك خەڵك لێی هەڵگەرێنەوە- پێشەوا مالیكیش بڕیارەكەی جێ بەجێ نەئەكرد، بۆیە ئەم جێ بەجێ نەكردنەی هۆكاری ئازاردانی پێشەوا مالیك بوو.

هەندێكی تریش باسی هۆكارێكی دیكەی ئەكەن بۆ بەڵاو ناخۆشیەكانی پێشەوا، و ئەڵێن: هەندێك لە خەڵك هاتن داوای بڕیارو فەتوایان لە پێشەوا مالیك كرد لەبارەی حوكمی ئەو كەسانەی لەگەڵ محمد كوڕی ئەبو عبدالله حسن ئەچنە ریزی بەرهەڵستكاران دژی عەباسیەكان، لەگەڵ هەبوونی پەیمان داری ئەمانە بە ئەبو جعفری مەنصور- ئەویش هەر لە عەباسیەكان، ئینجا پێشەوا مالیكیش پێیانی ووت: ئێوە بەزۆر پەیماناتان داوە بە ئەبو جعفر،زۆر لێكراویش هیچ پەیمانێكی لەسەر نیەو ئازادە، بۆیە خەڵكەكەش بەخێرایی چونە ریزەكانی محمدو یارمەتیان دا، هەندێك بەرژەوەند خوازانیش چونە لای ئەبو جعفر مەنصورو، ووتیان: مالیك باوەڕی بە پەیمانی ئێوە نیەو ئێوە بەستەمكار ئەژمێرێ، ئینجا ئەبو جعفریش لەمە توڕە بوو فەرمانی ئازاردانی مالیكی دەركرد،

فەرمانەکەشی جێ بەجێکراو پێشەوا مالیکیان ئازاردا ئەم رووداوەش لەساڵی ١٤٧ی کۆچی دا بوو.

هەندێکی دیکەش ئەڵێن: هۆکاری ئەم بەڵایە ئەوەبوو پێشەوا مالیك ژنهێنانی کاتی (متعه)ی بە حەرام ئەزانی، لەگەڵ ووتنی ئەوەش کە ئیبن عباس- سەرکردەی خێزانی جێنشینە عەباسیەکان- رێگەی بەم جۆرە ژنهێنانە داوە، بۆیە عەباسیەکان لێی تورە بوونو ئەزیەتو ئازاریان ئەدا.

هەندێکیش هەن ئەڵێن هۆکاری ئازاردانی ئەمەیە: پێشەوا مالیك (رەزای خوای لێبێت)، عثمان کوڕی عفان (رەزای خوای لێبێت)ی، لە پێش علی کوڕی ئەبو طالب (رەزای خوای لێبێت) دائەنا.

ئەمانەگریانەی چەند هۆکارێك بوون کە بوونە هۆی گەیاندنی ئازارو ناخۆشی بۆ سەر پێشەوا مالیك (رەزای خوای لێبێت)، بەڵام راستترین هۆکارو بەناوبانگترینیان هۆکاری یەکەمە.

دوای ئەوەی خەڵك بە ئازاردانی پێشەوا (مالیك)یان زانی، پێیان ناخۆش بوو، زۆریش تورە بوون لەوەی رێزی پێشەوا مالیك نەگیراوەو ئازار دراوە، ئینجا هەواڵەکە گەیشتەوە (مەنصور)، ترسا بۆیە پێشەوا (مالیك)ی بەگەورە داناو پاشان بڕیاری دەرکردنی ئامۆزاکەی خۆی، لە پۆستەکەدا، دەرکرد کە ناوی جعفر بوو، لەوکاتەدا لێپرسراوی شاری مەدینە بوو.

دوایی نامەیەکی داوای لێبوردنی بۆ پێشەوا مالیك ناردو تیایدا داوای لێبوردنی لێکرد لەبارەی ئەم رووداوەو داوای لێکرد لە وەرزی حەج

دا چاوی پێبکەوێت ئینجا مالیکیش سەردانی کرد، مەنصوریش ڕێزێکی گەورەی لێناو بەخێرهاتنێکی گەرمو گوڕی کرد، و لەخۆی نزیك کردەوە.

مەنصوری (جێنشین) لەو کاتەدا قسەکانی بەوە دەست پێکردو ووتی داوای لێبوردن ئەکەین لە مالیك لەبارەی لێدانەکەو ئازاردانی: سوێند بەو خوایەی کە هیچ پەستراوێك نیە جگە لە-(اللە)- نەبێت، ئەی ئەبو عبداللە نە فەرمانی ئەوەم پێکردبوو، نە پێش ئەوەی ڕووبدات هەواڵکەم زانیبێت، وە هەروەها لەو کاتەش کە هەواڵەکەم زانیوە پێی ڕازی نەبوم. ئینجا پێشەوا مالیك سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر هەموو باردۆخێك، و درودو سەلامی نارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ)و جێنشینیشی لەم ڕووداوە بەبێ ئاگادار دانا یاخود بەم کارە ڕازی نەبووە.

جێنیشینش بەردەوام بو لەسەر داوای لێبوردن کردنو ڕێزگرتنی پێشەوا مالیك، و ووتی: ئەی ئەبو عبداللە خەڵکی دوو حەرەم (مەککەو مەدینە) باشو چاکن هەتاوەکو تۆ لەناو ئەواندا بونت هەبێت.. مەنصور بەردەوام بو لە قسەکردنو داوای لێبوردن کردن، هەتا ئەو کاتەی پێشەوا مالیك ووتی: ئەی ئەمیری برواداران (خوا) لێت ببوریو پایەدارت بکا، ئەوا لێت خۆش بووم لەبەر نزیکیت لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)و نزیك بوونی ئەویش لە تۆوە.

ئینجا منصور ووتی: هەروەها خوای گەورەش لەتۆ خۆش بێت. بەمجۆرە ناخۆشیەکانی پێشەوا بە باشترین باروذۆخ کۆتایی پێهات. مەنصوریش داوای لە پێشەوا مالیك کرد ئەو فەرمودانەی لەبەری کردوون لە پەرتوکێکدا بیاننوسێتەوە، تاوەکو بەسەر شوێنەکانی دیکەی وولات دا

دابەشیان بکاتو خەڵکیش کردەوەی پێبکەنو داواشی لێکرد بەخێرایی ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێت، ئەویش پاداشتی نەکاتەوە. ئینجا پێشەوا مالیك هەستا بە ئەنجام دانی نووسینەوەی فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، پاشان مەهدی کوڕی مەنصوریش هاتە خزمەت پێشەوا مالیكو پەرتوکی (الموطأ)ی لێوەرگرت، فەرمانی دەرکرد لەبەر دەستنووس بنوسرێتەوەو دابەش بکرێت بەسەر ناوچەکانی دیکەی وولات دا، بەمجۆرە تاقیکردنەوەی پێشەوا لەسەرەتادا نازاردانی بوو، وە بە پاداشت کردنەوەو ڕێزلێگرتنیشی کۆتایی بە ناخۆشیەکانی هات.

## ١٣- بلاو بوونەوەی ڕێبازی پێشەوا مالیك:

ڕێبازی پێشەوا مالیك (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە شەریعەت دا، ڕوونکەرەوەیەکی باش بوو بۆ شەریعەت، قوتابیەکانیشی زۆر بوون، هەر قوتابیەکانیشی بوون هەڵسان بە بانگەواز کردنو شوێن کەوتنی ڕێبازەکەی لە هەڵێنجانی بڕیارەکان لە شەریعەتی ئیسلام دا.

یەکێك لەو هۆکارانەی کە بووە هۆی بلاوبوونەوەی ڕێبازی مالیك، ئازاد کردنی ناوچەکانی سەر ڕووی زەوی بوو هەروەها، هەڵسانی قوتابیەکانی پێشەوا بۆ بانگەواز کردن، ئەمانە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بلاوبوونەوەی ڕێبازەکەی.

ئەمەش بە ئاشکرا لە ئازاد کردنی ئەفریقیاو موسڵمان بوونی خەڵکەکەیەوە دەرئەکەوت، ئەمە بەردەوام بوو لە وڵاتەکانی وەکو: لیبیا، تونس، جزائیر، مغرب، وە پێش ئەمانەش لە وڵاتی ئەندەلوس (ئیسپانیا)ی ئێستاو دورگەی صقلیەو دورگەکانی دیکەی دەریای سپی

ناوەڕاست، بەهەمان شێوە لە وڵاتی سودانو مۆریتانیاو ئەو وڵاتانەی دیکەی قارەی ئەفریقیا کە ئازادکران.

هەروەها وڵاتی میسریش ڕێبازی مالیکی تیایدا لەسەر دەستی زانای بەتواناو بانگخواز عثمان کوڕی حکم ، ڕێبازەکەی تیادا بڵاوبوەوە تا ئەو کاتەی سەردەمی پێشەوا شافعی هات، ئینجا میسر بوو بە دوو بەش بەشێکیان لای دەریا بەزۆری لەسەر ڕێبازی شافعی مانەوە، بەشەکەی دیکەش هەتا ئەو سەردەمەی ئێستاش لەسەر ڕێبازی مالیکی مانەوە.

ڕێبازی مالیکی لە شاری مەدینە پەیدابوو پێگەیشتو نەشونمای کرد هەروەك زانیمان ئینجا لە بەشەکانی دیکەی (حجاز) بڵاویوەوەو تا ئەو کاتەی پێشەوا احمد کوڕی حنبل هاتو ڕێبازەکەی تیایدا بڵاوکردەوە، وجێگەی ڕێبازەکەی مالیکی گرتەوە، و تا ئێستاش هەر بەردەوامە.

## ١٤- کۆچی دوایی کردنی پێشەوا:-

پێشەوا مالیك بە ساڵاچوو بوو، تەمەنی گەیشتبووە نەوەت ساڵ، لە (١٠)ی (ربیع الاول) ی ساڵی (١٧٩)ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد. وەسیەتی کردبوو لە بەرگێکی سپی کفنی بۆ بکەن.... ئەم وەسیەتەشی لەو کاتەوە کرد کە هەستی کردبوو کاتی تەواو بوونی مۆڵەتی مانەوەی لەسەر زەوی هاتووە.

عبدالله کوڕی محمد کوڕی ئیبراهیم (هاشمی)ئەمیری مەدینە نوێژی لەسەر کردو بە پێیان هاتبوو، وە لەو کەسانەش بوو کە تەرمەکەی هەڵگرتبوو، ئەیبرد بۆ گۆڕستان.

هەروەها ئەوانەش نوێژیان لەسەر کرد کە خەڵکی شاری مەدینە بوون،

یاخود به سەردان هاتبوونو بە کۆچی دوایی پێشەوایان زانیبوو، زانایانی دونیا لەو سەردەمەدا زۆر بۆی غەمبار بوون، بەهەمان شێوە خەڵکی مەدینە بە گەورەو بچوکیەوە زۆر غەمبار بوونو داوای میهرەبانیو لێخۆشبوونیان ئەکرد لە خوای گەورە، بۆ ئەوەی لێی خۆش بێو چاکەکانی لێ وەربگرێتو سۆزو میهرەبانی لەگەڵ بنوێنێت. لە گۆڕستانی (بەقیع) بە خاك سپێردرا.

## ١٥- ئەو قسانەی لە دوای کۆچی دواییەوە لەبارەیەوە کراون:-

پێشەوا مالیك (رەحمەتی خوای لێبێت) زانایەکی دیارو بەرچاوو لێهاتوو بوو، لەو زانایانە بوو بە درێژایی مێژوو چاکەکانیان لە بیر ناکرێن، ئەمە راستیەکەو گۆڕانی بەسەردا نایەت لەوەی مردنی زانایەك بەڵایەکی گەورەیە کەس لە بیری ناچێتەوە، چونکە زانستەکەی هەر ئەمێنێتەوە. خەڵکیش هەر بە چاکە باسی ئەکەن، ئێستا ئێمە هەندێك لە وتەکانی زانایان باس ئەکەین کە لەبارەی پێشەوا (مالیك)ەوە (رەحمەتی خوای لێبێت) ووتویانە.

**١- ووتەی پێشەوا ئەبوحەنیفە:**

کەسم نەبینیوە زاناتر بێت لە مالیك دەربارەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

**٢- ووتەی عبدالرحمن کوڕی مهدی:**

گەیشتبمە هەر زانایەکی خەڵکی حجاز ئەوا رێزی پێشەوا مالیکی گرتووە، خوای گەورەش گەلی محمد (ﷺ) لەنێو حەرەمی مەککەو

مەدینە کۆناکاتەوە تەنها لەسەر راستیو ڕێنموونییەوە نەبێت. هیچ کەسێکیش لە مالیك متمانە پێکراوتر نەبوو لەبارەی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ).

### ٣-ووتەی پێشەوا شافعی:

ئەگەر لەبارەی (مالیك)ەوە قسەو گفتوگۆ کرا بێ دەنگ بە دەستی خۆت توند بگرە نەوەك هەڵە بکەیت ئەگەر شوێنەواریش هات ئەوا مالیك ئەستێرەی ڕێنموونی کارە.

### ٤- ووتەی ئەبو حاتەم رازی:

مالیك زۆر متمانە پێکراو بوو، پێشەوای خەڵکی حجاز بوو، دامەزراوترین هاوڕێی (زهری) بوو، ئەگەر زانایان جیاوازیان کەوتە نێوانەوە ئەوا حوکمو راستی بۆ (مالیك)ە، مالیك زانایەکی لێهاتوو، فەرموودەناسێکی بە توانا بوو، لە فەرموودەدا شارەزاتر بوو لە (ثوري)و (ئەوزاعی)دا.

### ٥- ووتەی ئەبو مصعب:

فێرخوازان قەڵەباڵغیان لەبەر دەرگای مالیکی کوڕی ئەنەس دروست ئەکرد، پێشبڕکێیان ئەکرد لەوەی کامەیان زۆرتر بگەنە بەردەرگا. ئێمە کاتێك لەلای مالیك زانستمان ئەخوێند، کەسمان قسەی نەئەکردو ملی خۆمان درێژ ئەکرد واتە زۆر بێ دەنگ ئەبووینو گوێمان لە وانەکانی ئەگرت. دەسەڵاتداران لێی ئەترسانو گوێیان بۆ ئەگرت، لە وەڵامی هەر پرسێکیشدا ئەی ووت: نەخێر یان بەڵێ، کەسیش پێی نەئەووت: ئەم ووتەیەت لە کوێ هێناوە؟

**٦- ووتەی پێشەوا (نەوەوی) لەبارەی مالیکدا:**

گرزی زانایان هەموویان کۆکن لەسەر پێشەوایەتیەکەی‌و گەورەییەکەیدا، زۆر بەرێزو زاناو تێگەیشتووبوو، دان پیانراو بوو لەبارەی بەهێزی (یادەوەری)و لەبەرکردن‌و زانست‌و دامەزراوییەکەی، بە گەورە سەیرکردن‌و رێزلێنانی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ).

**٧- ووتەی ئیبن ئەثیر:**

شافعی ئەوەندە رێزو گەورەیی بەسە لەوەی پێشەوا مالیك مامۆستاو رابەری بێت، شافعی ئەیووت: مالیك مامۆستامە، منیش خزمەتکارێکم لە خزمەت کارەکانی مالیك.

**٨- ووتەی عبداللە کوڕی مبارەك:**

کەسێکم نەبینیوە لە مالیك زیاتر رێزو گەورەیی دابنێت بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و پێگیرتر بێت لەسەر ئاین لە مالیکدا. ئەگەر داوام لێبکەن پێشەوایەك بۆ هەموو گەلی موسلمان دیاری بکەم ئەوا (مالیك)م بە پێشەوا دەست نیشان ئەکرد.

**٩- ووتەی حماد کوڕی سلمە:**

ئەگەر پێم بلێن پێشەوایەك بۆ گەلی پێغەمبەر (ﷺ) هەلبژێرە تاوەکو لێیەوە فێری ئاین‌و زانست بن، ئەوا مالیکم بە شیاو دانەنا بۆ فێرکردنی ئەمەو پێشەوایەتی کردنی گەلی موسلمان.

**١٦- لە ووتەکانی پێشەوا:-**

١- زانست ڕووناکییە تەنها لە دڵی لە خواترس‌و ملکەچ بە فەرمانەکانی خوادا هۆگر ئەبێت.

٢- ئەم زانستە (فەرموودە، شەرع) ئاینە، تەماشا بکەن‌و بیربکەنەوە

بزانن لە (کێ) ئەم ئایینە وەرئەگرن.
٣- پێویستە لەسەر ئەو کەسەی زانست ئەخوێنێت دامەزراوو لە خواترس و بەڕێز بێت.
٤- چاکە نییە لە کەسێك بارودۆخێك بە رەوا ببینێ بۆ خۆی، بەڵام بۆ خەڵکی بە رەوا نەبینێ.
٥- باشترینی کارەکان روون و ئاشکراکەیەتی، ئەگەر لە نێوان دوو کاردا بووی نەتنەزانی کامەیان باش و چاکە ئەبووایە یەکێك لەو دوو نیشەت بکردبایە ئەوا ئەوەیان ئەنجام بدە کە گومانی کەمترەو دامەزراوترو روونترە.
٦- هەر کەسێك پشت لە دونیا بکات و خواپەرستی تەواو ئەنجام بدات ئەوا خوای گەورە فێری زانست و دانایی ئەکات.
٧- ئەگەر مرۆڤ مەدح و ستایشی خۆی بکات ئەوا بەهاو رێزی خۆی لە دەست ئەدات.
٨- زانست بە گێڕانەوەی زۆر نییە، بەڵکو روناکییەکە خوای گەورە ئەیکاتە نێو دڵەوە.
٩- پێیان راگەیاندم: زانایان لە رۆژی دواییدا هەمان پرسیاری پێغەمبەرانیان (ﷺ) لێ ئەکرێت
١٠- هەر کەس پێی خۆش بێت وەڵامی پرسیارێك (بابەتێکی شەرعی) بداتەوە، با بەهەشت و دۆزەخ بێنێتە پێش چاوی خۆی، بزانێت چۆن لە دوارۆژدا خۆی رزگار ئەکات.

١١- فێربوونی زانست کارێکی جوانو پیرۆزه، بەڵام بیر بکەرەوه کاتێك پێویسته ئیشێك ئەنجام بدەیو پێیەوه پابەند بێت، ئەوا ئەنجامی بده.

١٢- بێ فیزی له خواپەرستیو ئایین دایه، نەك له پۆشاکدا.. ئێمه له خواپەرستیو ئاییندا بێ فیزبووین نەوەك له جلو بەرگدا.

١٣- مرۆڤ ئەو کاته باشو چاك ئەبێت که سنووری لێپرسراوێتی خۆیو ئەرکەکانی سەر شانی بزانێتو واز لەو شتانه بێنێت که ئەرکی ئەو نییەو ئەو کارانەش بکات که پەیوەندی پێیەوه هەیه. ئینجا ئەگەر وەهای کرد نزیکه خوای گەوره دڵەکەی بەرەو خۆی (واته بەرەو خوای گەوره) بکاتەوه.

١٤- ئەگەر مرۆڤ سوودو چاکەی بۆ خۆی نەبوو، ئەوا بۆ خەڵکیشی سوودو چاکەی نییه.

١٥- خوای گەوره نیعمەتو خۆشی بەسەر هەر کەسێکدا رژاند ئەوا پێشی خۆشه شوێنەواری نیعمەتو خۆشییەکەی لێیەوه دەربکەوێت، بەتایبەت زانایان پێویسته لەسەریان (بەرێزو پاکی) له پۆشاکیان نیشان بدەن وەك رێزگرتنێك بۆ زانستو زانیاری.

١٦- لەسەر دادوەر پێویسته دانەبڕێت له زانایان، هەر کاتێك رووداوێكو کێشەیەکی هاته بەردەم سەردانی زانایان بکاتو راوێژیان پێ بکات.

١٧- ئەگەر ئیشێکیان پێسپاردی خۆتی بۆ ئاماده بکه، جگه له هەڵسەنگاندنی خۆت ئەوا به بیرو هەڵسەنگاندنی خەڵکیش، هەڵسەنگاندنی بۆ بکه، چونکه هەڵسەنگاندن کەلەبەرو ناتەواوی بیرو

راو بڕیارەکان ناهێڵێت هەروەك چۆن ئاگر خڵتەو خاڵی زێڕ لا ئـەبات‌و ناهێڵێت.

## ١٧- وانەو ئامۆژگاری وەرگرتن لە ژیانی پێشەوادا:

١- بە گەورە زانینی زانایان‌و ڕێزگرتنیـان لەسـەر هـەموو موسـڵمانێکی پیاوو ئافرەت پێویستە.

٢- لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز متمانە ئەبەخشێتە (خود) لـەکاتی گـەورە بووندا.

٣- موسڵمان بەرنامەی ژیان لە قورئانی پیرۆزو سونەتی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) وەرئەگرێت.

٤- فێربوون لە تەمەنی منداڵیدا وەکو نەخش‌و کۆڵینە لەسـەر بـەرد، لـە تەمەنی گەورەیشدا وەکو نووسینە لەسەر ئاو.

٥- خەریك بوون بە زانست‌و زانیاری پلەو پایەی مرۆڤ لەلای خوای گەورە بەرز ئەکاتەوە.

٦- موسڵمان ڕێز لە مامۆستاکانی ئەگرێت‌و بی ڕێزیان لەگەڵ ئانوێنێت

٧- بۆ موسڵمان دروست نییە لە بەرامبەر ستەم کردن بـێ دەنـگ بێـت، پێویستە هەق‌و ڕاستی بڵێت‌و تەنها لە خوای گەورە بترسێت.

٨-پێویستە لەسەر موسڵمان ڕێزی ئەو کەسانە بگرێـت کـە ئامۆژگـاری‌و ڕێی جوانی نیشان ئەدەن.

٩- موسـڵمان هەڵناخەڵـەتێ بـە سـتایش کردنـی (بـەرەو ڕوو) لەلایـەن خەڵکەوە بۆ ئەو.

١٠-دڵسۆزی‌و نیاز پاکی لە کارو کردەوەدا لە ڕەوشتی موسڵمانی چاکە خوازە.

## ١- ناو، بنەماڵە، لەدایکبوون:

پێشەوا احمد کوڕی حنبل نازناوی ئەبو عبداللە یەو ناوی احمد کوڕی محمد کوڕی حنبل، کوڕی هلال کوڕی ئەسەد کوڕی ئیدریس، کوڕی عبداللە کوڕی حیان کوڕی عبداللە، کوڕی ئەنەس کوڕی عەوف کوڕی قاسط کوڕی مازن، کوڕی شیبان کوڕی ذهل کوڕی ثعلبە، کوڕی عکابە، کوڕی صعب کوڕی علی کوڕی بکر، کوڕی وائل کوڕی قاسط کوڕی وهب، کوڕی افصی کوڕی دعمی کوڕی جدیلە، کوڕی ئەسەد کوڕی ربیعە کوڕی نزار کوڕی معد کوڕی عدنانە.

ڕەچەڵەك‌و بنەماڵەی لە (نزاری کوڕی معد کوڕی عدنان) ئەگاتەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ).

کوڕی حنبل لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١٦٤)ی کۆچی لە شاری بغداد (دوای ئەوەی دایکی‌و ئەو- کە هێشتا لە سکی دایکیدابوو) لە شاری (مرو) ماڵەکەیان بەرەو بەغداد گواستەوە) لە- بەغداد- لە دایکبووە.

دایکی ناوی صفیە کچی میمونە کچی عبدالملك کوڕی شیبانە. محمد کوڕی حنبل ژیانی خێزانی لەگەڵ (صفیە)دا پێکهێنا بەڵام ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە نەمانەوە چونکە (محمد)ی باوك کۆچی دوایی کردو ئەحمەد بە هێتیمی مایەوە. ئینجا دایکی ژیانی خۆی بەخشییە کوڕە تاقانەکەی‌و بێوەژنێتی هەڵبژارد لەپێناو بەخێوکردن‌و پێگەیاندنێکی ڕێکوپێکانەی کوڕە بێبەشەکەی لە سۆزی باوکایەتی.

بەڵێ ئەم ژیانەی هەڵبژارد لەکاتێکدا کە هێشتا ژنێکی گەنج بوو، بە پێچەوانەی ئەو ژنانەی کە مێردیان مردووەو شووکردنەوە بە باشتر دائەنێن وەك خۆپارێزیەك لە هەموو خراپەیەك. (صفیە) خانمی دایکی پێشەوا احمد وەك ژنەکانی سەردەمی خۆی نەکرد، بەڵکو ژیانی خۆی پێشکەش کردە احمدی تاقانەی بێ خوشكو برا، دایکی هەموو ژیانی خۆی لە پەروەردەکردنو پێگەیاندنیدا خەرج کرد تاوەکو کوڕەکەی خۆی بەخشیە گەلی موسڵمانو بووە پێشەوایەکی هەڵکەوتوو، و بێ وێنە کە خەڵك بیکەنە پێشەواو رابەری خۆیان.

پێشەوا احمد هەر لە منداڵیەوە نیشانەی هەڵسوکەوتی باڵا لە راستیو چاکیدا پێوە دیاربوو. بە شێوەیەك بوو تاوەکو جارێکیان (هیشم کوڕی جمیل)ی زاناو شارەزاو فەرموودەناسی لێهاتوو لە بارەی داهاتووی احمد کوڕی حنبل- هێشتا هەر منداڵە- ئەڵێت: (ئەگەر هاتوو ئەم منداڵە تەمەنی درێژ بێت ئەوا ئەبێتە پێشەوای سەردەمی خۆی) لە راستیدا پێشبینیەکەی راست دەرچوو. بە هەمان شێوە (ابراهیم کوڕی شماس)ی خواناسی واز لە دونیا هێناو (زاهد) لەبارەیەوە ئەڵێت: (ئەمبینی احمد کوڕی حنبل شەوی بە خواپەرستی زیندو ئەکردەوە، لە کاتێکدا هێشتا بچووك بوو). (احمد) بە هەژاری پێگەیشت چونکە کاتێك باوکی کۆچی دوایی کرد جگە لە خانووێکی بچووك کە تیایدا نیشتەجێ بوون- هیچ شتێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتبوو. سەرەڕای ئەم هەژاریەش پێشەوا احمد پێگیر بوو لەسەر ئەوەی خواردنو خواردنەوەی حەڵاڵ بخوات.

هەروەها ماڵێکی شی بەکارنەدەهێنا، کە گومـانی حـەرامی لێبکردایـە، هەروەها دیاریو (بەخشین)یشی وەرنەئەگرت.

(ﷺ)

## ٢- پێگەیشتنی زانستییانەی:

پێشەوا احمد بەردەوام حەزی لە زانستو خوێندن بووەو، هەمیشەو لە هەموو کاتو سەردەمێکدا بە دوای زانستدا وێڵ بوو. لە کاتێکدا هێشتا منالێکی چواردە ساڵی بوو کە قورئانی پـیرۆزی لەبـەر کردبـوو، زانسـتی زمانو (نووسین)ەوەی تۆمارەکانی خوێندبوو. دایکی ترسـی مانـدوبوونو حەز لێ رۆیشتنی کوڕەکەی لە فێربـوونو خوێندنـدا لێنیـشتبوو، چـونکە بەردەوام بە شەوو بە رۆژ خەریکی فێربوونی زانسـتو خوێنـدن بـوو، بـە شێوەیەك بوو ئەیویست پێش ئەوەی نوێژی بەیانی ببێـت بـە ماوەیـەکی زۆر- هێشتا دونیـا زۆر هـەر تاریـك بـوو- هـەوڵی دەدا بـە مەبەسـتی خوێندن لە ماڵ بچێتە دەرەوە. بۆیە دایکیشی لـە ترسـی ئـەوەی ئـەوەك تووشی ناخۆشییەك بێت رێگری لێنەکرد لەوەی هێشتا دونیا زۆر تاریکەو خەڵك هەڵنەستاوە بچێتە دەرەوە، تاوەکو نوێژی بەیانی ئـەهات، ئینجـا رێگەی چوونە دەرەوەی پێئەدا.

پێشەوا احمـد سـەرەڕای هەژاریەکـەی بـە مەبەسـتی خوێنـدن چـۆتە مەککەو مەدینەو شـامو یەمـەنو کوفـەو بەسـرە. رۆژێکیـان پیـاوێکی ناسراویان پێی ووت: جارێك ئەڕۆیتە کوفەو جارێکیـشیان بـەرەو بەسـرە ئەڕۆیت... ئایا هەتا کەی، بۆ واز ناهێنیت؟ جارێکیان لە بەغداد بـەرەو

شام نەڕۆیشت بە مەبەستی ئەوەی تاوەکو لەوێ گوێ لە فەرموودەناسێکی بەناوبانگ بگرێتو فەرموودەی لێیەوە فێر بێت. کاتێك گەیشتە لای فەرموودەناسەکە، بینی کە ئەو خەریکی ئەوەبوو خواردن ئەداتە سەگێك. ئینجا (کوڕی حنبل) دانیشت، ئەویش بەردەوام بوو لەسەر پێدانی خواردن بە سەگەکە. دوای ئەوەی لە پێدانی خواردنەکە تەواو بوو، رووی کردە (کوڕی حنبل)و پێی ووت: لەوانەیە شتێك لە ناو دڵتدا دروست ببێت؟ (کوڕی حنبل)یش ووتی: بەڵێ.

فەرموودەناسەکە ووتی: لە لای ئێمە سەگی لێنییە، ئەم سەگەش هاتە لای من، ویستی خواردنو ئاوی بدەمێ، ئینجا زانیم کە برسیو تێنووە، بۆیە خواردنو ئاوم پێداو حەزەکەیم هێنایەدی، چونکە لە (ئەبو زناد)م بیستووە، ئەویش لە (ئەعرەج)، ئەویش لە (ئەبو هورەیرە) ی (ر.خ) بیستووە، کە ئەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك ئاواتو خۆزگەی (کاری) کەسێك کە هانای هێناوەتە لای ئەو، بهێنێتە دیو ئیشەکەی رایی بکات، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی دواییدا ئاواتەکانی دێنێتە دیو لە هانایەوە دێت). ئینجا پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حنبل زەردەخەنەیەکی هاتێو ووتی: ئەم فەرموودەیەم بەسەو، پاشان بەرەو بەغداد گەڕایەوە، جگە لەمە لەو ناخۆشیانەی ئەهاتنە سەر رێگای پێشەوا ئەحمەد لەکاتی خوێندنی فەرموودەو بەدواداگەڕانیو کۆکردنەوەیدا. هەروەها پێشەوا ئەحمەد زۆر گرنگی ئەدا بە گێڕەرەوەی فەرموودەو بە سانایی فەرموودەی وەرنەئەگرت تاوەکو گێڕەوەکەی جوان

نەناسیبایە. بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاوەکو لە بواری فەرمووەدا بووە یەکێك لەو پێشەوایانەی، کە زانایانو پێشەوا بەناوبانگەکانی سەردەمەکەی گەواهی زانایی‌و لێهاتوویانەی بۆ داوە. پێشەوا شافعی لەم بارەیەوە- جارێکیان- بە احمد کوری حنبل ئەڵێت: ئێوە لە من زاناترن لە بارەی فەرموودەو گێڕەرەوەکانی. شافعی کاتێك لە مصر بوو رۆژێکیان بە (ربیع کوری سلیمان)ی قوتابی ووت: احمد کوری حنبل زاناو پێشەوایە لە هەشت بواری زانستیدا، پێشەوایە لە فەرموودەدا، پێشەوایە لە شەرع (فقه)دا، پێشەوایە لە زماندا، پێشەوایە لە قورئانو راڤەدا، پێشەوایە لە هەژاریدا، پێشەوایە لە دونیا نەویست (زهد)دا، پێشەوایە لە خواپەرستیدا، پێەشەوایە لە سوننەتدا.

پێشەوا احمد گەشتی زۆری ئەکردو لە شوێنێك ئەچوو بۆ شوێنێکی تر لە پێناو کۆکردنەوەی فەرموودەدا با هەرچەند ژمارەشی کەم بوایە، خۆ ئەگەر لە گەشتێکیدا تەنها یەك فەرموودەی ببیستبا ئەوا خۆی بە سەرکەوتوو دائەنا، هەرگیز لەم پێناوەدا گرنگی بە ماندوو بوون نەئەدا... بۆیە زۆرێك لە زاناو شارەزایان ئەڵێن زیاتر فەرموودەناسە تاوەکو شەرع ناس بێت. ئەوەی لێی ئەگێڕنەوە- لە بارەی فێربوونو بەردەوام بوون لە خوێندنو بەدوادا گەڕانی زانستدا، ئەم ووتە بەناوبانگەیەتی ئەویش (لەگەڵ پێنوسو کاغەزم تاوەکو گۆڕ) هەروەها ئەم وتەیەشی (بەردەوام بە دوای زانستەوەمو ئەخوێنم تاوەکو ئەمرمو ئەچمە نێو گۆڕ).

بەم شێوەیە پێشەوا ئەحمەد بە درێژایی ژیانی خەریکی فێربوونی زانست بوو، بەردەوامیش بوو لەسەر گەڕان بە دوای فەرموودەداو شارەزا بوون لێیەوە تاوەکو بوو بە پێشەوایەکی دیارو بەرچاو لەم بوارەدا. هەندێك خەڵك ئەم بەردەوام بوونەی لە خوێندنو گەڕان بە دوای فەرموودەدا سەرەڕای ئەوەی بوو بووە پێشەوایەکی دیارو بەرچاو پێیان سەیر بوو بۆیە پێیان ووت: تاکەی خەریکی خوێندنیو تۆ گەیشتی بەم پایە زانستیە باڵایەو ئێستا بوویتە پێشەوا؟ پێشەوا (احمد)یش وەڵامە بەناوبانگەکەی کە لە پێشدا رابرد- دایەوە: ((لەگەڵ پێنوسو کاغەزم تاوەکو نێو گۆڕ)) ئەمە ووشەیەکە مرۆڤ رائەچڵەکێنێو بە ئاگای ئەهێنێتەوە. هەروەها ووزەیەکی بەهێزی تیایە کە لە بەرنامەو رێنمونی ئەو ئیسلامە وەرگیراوە کە فێرمان ئەکات هەر لە مناڵیەوە تاوەکو مردن بخوێنین. بۆیە احمد کوڕی حنبل بە درێژایی ژیانی پێنوسو کاغەزی پێ بوو تاوەکو ئەوەی خوێندوویەتی، لێی بنووسێتەوە هەمیشە بەردەوام بە شوێن زانستدا ئەگەڕا. خۆزگە هەموو قوتابییەك ئەم ووتەیەی (احمد کوڕ ی حنبل)ی کە ئەڵێت ((لەگەڵ پێنوسو کاغەزم تاوەکو نێو گۆڕ))و هەروەها ئەمەشی ((بەردەوام بە دوای زانستەوەمو ئەخوێنم تاوەکو نێو گۆڕ)) لەبەر چاو بگرتایەو بیکردبایە سەرمەشقی ژیانی خۆی.

پێشەوا ئەحمەد (رەزای خوای لێبێت) پشتی بە یادەوەریو هێزی لەبەرکردنی نەئەبەست، بەڵکو هەر زانیارییەکی فێرببوایە ئەوا ئەینووسیەوە، بەهەمان شێوە ئەگەر فەرموودەیەك فێرببوایە ئەوا تەنها

لەسەر پەرتوك، فێرخوازی، فێرنەکرد با هەرچەند فەرموودەکەشی لەبەر بوایە.

## ٣- مامۆستاو رابەرەکانی:

پێشەوا احمد مامۆستای فەرموودەی جیابوو، لەگەڵ مامۆستای زانستی شەرع، هەروەها رێزێکی بێ ئەندازەی لێ ئەگرتن‌و نرخی مامۆستاو گەورەیی پایەکەشی ئەزانی. ئەمەش لە سروشتی ئەو بوو... تا ئێستا ئێمە مامۆستاکانی پێشەوا احمد کوڕی حنبل باس ئەکەین.

یەکەم/ مامۆستاکانی لە بواری فەرموودەدا:

ئەبوسف هاوڕێی ئەبو حەنیفە یەکەمین مامۆستای احمد کوڕی حنبل بوو لەکاتی تازە پێگەیشتنیدا، بەڵام ماوەیەکی زۆری لەلا نەماوە بەڵکو وازی لێ هێناو چووە خزمەت هشیم کوڕی بشیر تاوەکو لە خزمەتیدا فەرموودە فێرببێت. پێشەوا احمد کوڕی حنبل لەبارەیەوە ئەڵێت: ((هشیم کوڕی بشیر یادی خوای زۆر ئەکرد، چوار جار یان پێنج جار لە خزمەتی بووم لەبەر رێزو شکۆی ئەو لەم ماوەیەدا تەنها دووجار پرسیارم لێکرد ئەگەرنا هەر بێ دەنگ بووم)). پاشان لە خزمەت عمیر کوڕی عبداللە کوڕی خالدو لە خزمەت عبدالرحمن کوڕی مهدی‌و لەلای ئەبوبکر کوڕی عیاش فەرموودەی خوێندووە.

دوای ئەوەی هشیم کۆچی دوایی کرد پێشەوا احمد لە هەر کوێیەك فەرموودەی لێبووایە ئەوا بەرەو ئەوێ گەشتی ئەکرد، بۆیە چۆتە خزمەت



زۆرێك لە مامۆستایان لە کوفـەو بەسـرەو مەککـەو مەدینـەو یەمـەنو شوێنی دیکەی نیوە دوورگەی عـەرەبی.

بەڵێ زۆر شوێن لە پێناو فێربوونی فەرموودەدا گەڕاوە، هەروەك لەلای بشر کوڕی مفضل، اسماعیل کوڕی بشر، سفیان کوڕی عیینە، جریر کـوڕی عبدالحمید، یحیی کوڕی سعید (القطان)، ئەبو داود (الطیالـسي)، عبـدالله کوڕی نمیر، عبدالرزاق، پێشەوا شافعیو کۆمەڵێکی دیکـەش فـەرموودەی خوێندووە.کوڕی جوزی لە باسی ژیاننامەکەیدا، باسی ژمارەیان ئـەکاتو ئەڵێت: چوار سەدو چواردە مامۆسـتای پیـاوو یـەك مامۆسـتای ژن بـوو ئەویش: دایکی عمر کچی حسان کوڕی زیدی ثەقەفی بوو.

دووەم/ مامۆستاکانی لە بواری شەرع (فقە)دا:

لە بواری شەرعدا نەمانزانیوە پێشەوا احمد جگە لـە پێـشەوا شـافعی لەلای هیچ زانایەکی دیکەی خوێندبێت، پێـشەوا شافعیـشی لـە مەککـە دۆزییەوە کاتێك بە سەردان چووە شاری مەککەو کـۆڕی وانـە ووتنـەوەی پێشەوا شافعی پێ باشتر بوو لە کۆڕی وانە ووتنەوەی کوڕی عیینە، بۆیـە تـەنها لـەلای شـافعی فێـرە شـەرعو تێگەیـشتنو هـەڵێنجانو چـۆنیەتی دەرکردنی بڕیاری شەرعی بووە.

## ٤- کۆڕە زانستیەکەی:

دوای ئەوەی پێشەوا احمد کـوڕی حنبـل زانیارییـەکی زۆری بەدەسـت هێناو پلەیەکی بالای زانـستی بـڕیو بەشـێوەیەکی لێهـاتووو بـێ وێنـە

شارەزابوو لە بوارەکانی زانستە جیاجیاکانو گەیشتە خزمەت زۆرێـك لـە زاناو مامۆستا گەورەکان. پاش ماندوو بوونێکی زۆرو شەونخونیەکی کـەم وێنە توانستی ئەوەی پەیدابوو کـە بتوانێـت دابنیـشێتو کـۆڕی زانـستی تایبەت بەخۆی بکاتەوەو خەڵکیو فێرخوازان لە زانـستەکەی بەهرەمەنـد بن. بەڵێ بەم شێوەیە لە تەمەنی چل ساڵی لە یـەکێك لـە مزگەوتـەکانی بەغداد دانیشت بۆ وانە ووتنەوەو بڵاوکردنەوەی زانستە شەرعییەکان. دوو جۆر شێوازی پەیڕەو ئەکرد لـە وانـە ووتنـەوەدا: وانـەی گـشتیو وانـەی تایبەتی.

وانە گشتییەکەی لە دوای ئەنجامدانی نوێژی عەسر لە مزگەوت کۆڕی بۆ ئەبەستو وانەیەکی بەناوبانگ بوو خەڵکانێکی زۆر تامەزرۆی بیستنی فەرمایشتو ئامۆژگارییەکانی بوون، بەشێوەیەك بوو هەتاوەکو ئەگێڕنەوە ژمارەی ئامادەبووان ئەگەیـشتە (پێـنج هـەزار) کـەس، کـە لـە شـوێنە جیاجیاکان ئەهاتن، هەبوو تیایدا بۆ فێربوونی زانست هاتبوو، هەیان بـوو بۆ ئامۆژگاری وەرگرتن هاتبوو، هەبوو بۆ ئەوە هـاتبوو تـاوەکو چـاو لـە رەفتارو رەوشتی بکاتو بەهۆیەوە رێگەی راسـت بدۆزێتـەوە، هـەبوو بـۆ بەرەکەت وەرگرتن هاتبوو.

وانەکانی لەگەڵ ئەوەی خەڵکێکی زۆر ئامادەی ئەبوون، بەڵام هێمنیو دڵنیاییو ئارامی باڵی بەسەر کۆمەڵەکە ئەکێـشا، پێـشەوا احمـد (رەزای خوای لێبێت) گاڵتەی نەئـەکردو حەزیـشی لێ نـەبوو، رێگریـشی ئـەکرد لەوەی کەسانی تر گاڵتە بکەن، بۆیـە هـەر کەسـێك بـەردەوام حـەزی لـە

گاڵتەوگەپ کردن بوایەو لەنێو کۆڕەکەی دانیشتبایە، ئەوا لەکاتی ئامادەبوونی پێشەوا (احمد)دا بەبێ دەنگی دادەنیشت. ئەمە لەبارەی وانەی گشتییەوە بوو، بەڵام وانەی تایبەتی، ئەوا لە ماڵەکەی خۆی کۆڕی بۆ ئەبەستو فێرخوازان ئەهاتنە ماڵەکەی.

لەبەر ئەم هۆیە پێشەوا احمد بە رابەری عێراقو پێشەوای رابەرانی بەغداد ناوی دەرکردبوو. ئەمەش لەبەر ئەوەی هەموو رەفتارو تایبەتمەندیەکی پێشەوایەتیو رابەرایەتی تیادا هاتبووە جێ.

چونکە پێشەوایەتیو رابەرایەتی کردن تایبەتمەندی دیاریکراوو مەرجی خۆی هەیەو لە هەموو کەسێکدا نایەتەدی کە ژیانی خۆی بەخشیبێتە زانستو تیایدا قاڵ بوویێتەوەو ناوبانگی دەرکردبێتو بۆ هەموو موسڵمانێکیش رێك ناکەوێت با شەو نوێژی زۆری هەبێتو بەردەوام بە رۆژوو بێت، بەڵکو پێشەوایەتی زانستو کردارە بەیەکەوە، فەرموودەو شەرعە بەیەکەوە، تێکۆشانی چاكو هەڵێنجانی بڕیارەکان بەشێوەیەکی راستو دروست، رەفتارو هەڵسوکەوتی چاكو خواپەرستیو بەرچاو روونیو لەسەر رێی راست بێت، پێشەنگێکی ئامۆژگارو وانەو خوێندنو زانستێکی زۆر، ئازایەتیو دامەزراویو دونیا نەویستیو خۆپاراستن لە دەسەڵاتو هاتوچۆنەکردنی دەسەلاتداران، پشت بە خۆبەستن لە بەڕێ کردنی ژیانو چاو لە دەستی خەڵکی نەبوون، بەڕێزیو شکۆداریو خەڵك خۆش ویستنو رێز لێ گرتنیانو نواندنی سۆزو بەزەیی بۆ منداڵی هێتیم، نەرمو نیانو بە لێبوردەو بەرگریکاری راستیو دادپەروەرو رێگربێت لە ستەمو ستەمکاری، ئەمانە هەمووی رەفتاری پێشەوایەتی بوو. پێشەوا

(احمد کوڕی حنبل)یش خاوەن هـەموو ئـەم توانـستانە بـوو، بۆیـە بـووە پێشەواو رابەری موسـڵمانانو وەلاٌمـی کێـشەکانیانی ئەدایـەوەو بڕیـارو یاسـای گونجـاوی شـەرعی، لـەژێر سـێبەری قورئـانی پـیرۆزو سـوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ دەرئەکردن، لەبەر ئەم هۆکارانە بوو سەرنجی هـەموو فێرخـوازە دڵـسۆزەکانی بـۆ لای خـۆی راکێـشابوو ئەوانـەی لـە شـوێنە جیاجیاکانـەوە ئەهاتنــە خزمــەتی بــۆ بەهرەمەنـد بـوون لــە کانیــاوی زانستەکەی .

## ٥- قوتابییەکانی پێشەوا:-

پێشەوا احمد کوڕی حنبل (ڕەزای خوای لێبێت) قوتابیەکی زۆری لـەلا بەهرەمەند بوونو ئاستێکی بالاٌیان لە زانستەکان دا بڕیـوە کـە شـایانی ڕێزو ستایشن، ئێستا هەندێك لە قوتابیەکانی پێشەوا احمد باس ئەکەین.

### ١- عبدالله کوڕی احمد کوڕی حنبل:

نازناوی ((ئەبو عبدالرحمن))ە لای باوکی خوێندویەتیو فێربووە تاوەکو شارەزاییەکی تەواوی بەدەست هێناوەو بۆتە زانا. لـەو کەسـانە بـووە کـە پەرتوکی (المسند))ی پێشەوایان بەخـەڵکی راگەیانـدوە، هـەروەها شـەرع (فقە)یشی بلاٌوکردۆتەوە. بەلاٌم ئەوە هەیە زیاتر لە فـەرموودەدا شـارەزاتر بـووەو لـە بلاٌوکـردەوەو فێرکردنـی فێرخوازانـدا لـە فـەرموودەدا زیـاتر ناوبانگی هەبووە تاوەکو لە شەرع. لەساڵی (٢٩٠)ی کۆچـی لـە بەغـداد کۆچی دوایی کردوە.

### ٢- صالح کوڕی احمد کوڕی حنبل:

صالح لەلای باوکیو جگە لە باوکی شەرعی خوێندووە. کاتێکیش بووە دادوەر هەر کێشەیەکی بەرەو ڕوو ببوایە- بۆ ئەوەی چارەسەری بکات- یاخود پرسیارێکیان لێکردبایە، لەژێر سەرپەرشتی باوکی وەڵامەکانی ئەدایەوە بۆیە توانی ڕێبازی باوکی لە شەرع دا بەخەڵکی رابگەیەنێتو کێشەکانی ئەوانی پێ چارەسەر ئەکرد. نازناوی ((ئەبو فضل)) بوو لەساڵی (٢٦٥)ی کۆچی لە ئەصفەهان کۆچی دوایی کردوە.

### ٣- ئەبو بکر مروزی:

لە هاوڕێیە نزیکو دڵسۆزەکانی پێشەوا بووە. لە خزمەت پێشەوادا لە شەرع شارەزا بووە. زۆرێك لە بیرو راکانی پێشەوا (احمد)ی لە بواری شەرعدا بەخەڵك راگەیاندوە، پێشەوای زۆر خۆش ویستوەو زانستو کردارەکەی کاریگەری قوڵی کردۆتە سەر دڵو دەرونی بۆیە هەوڵی بڵاوکردنەوەی ڕێبازەکەی داوە لە بواری شەرع دا. کاتێك لەبارەی (زانستو زانیاریەکەی) پرسیاری لێ ئەکرێت ئەگرێتو ئەڵێت: ئەم زانستە هی من نیە بەڵکو زانستی (احمد کوڕی حنبل)ە. لەساڵی (٢٧٥ی ك) کۆچی دوایی کردوە.

### ٤- ابراهیم کوڕی اسحاق حربی:

خواپەرستو دنیا نەویستو زانایەکی گەورە بوو، لە خزمەت پێشەوا (احمد) زانستی شەرعو فەرموودەی خوێندوە، تەنها خەریکی بڵاوکردنەوەی زانستو زانیاری بووە. ڕۆژێکیان جێنشین (خلیفە) معتضد

(دە) هەزار درهەمی بۆ ئەنێرێت، ئەویش وەرناگرێت‌و بۆی ئەگەڕێنێتەوە، ئینجا (جێنشین) ئەمجارە بۆی ئەنێرێتەوە تاوەکو بەسەر هاوسێیەکانی دابەشی بکات. ابرهیم کوڕی (اسحاق)یش بە نێردراوەکە ئەڵێت: بڵێ بە ئەمیری بڕواداران: مادام ئێمە خۆمان بە کۆکردنەوەی خەریك نەکردووە، ئەوا خەریکمان مەکەن بە بڵاوکردنەوەی ئەم پارەیە. بڕۆ بە ئەمیری بڕواداران بڵێ: با وازمان لێ بێنێت‌و ئەم ئەمان کات بە هاوسێی خۆی.. ابراهیم (رەحمەتی خوای لێبێت) لەساڵی (٢٨٥ی کۆچی) کۆچی دوایی کردووە.

هەروەها جگە لەمانەی باسمان کردن عبدالملك (الميموني)، ئەبو داود سلیمان کوڕی ئەشعەث، ئەبوبەکر احمد کوڕی هارون، ئەبو علی حسین کوڕی عبدالله (الخرقي)، ئەبو حسن علی کوڕی محمد کوڕی بشار، ئەبو قاسم عمر کوڕی حسین کوڕی عبدالله (الخرقي)، ئەبو حسین کوڕی عبدالعزیز حارث تەمیمی، دادوەر ئەبو علی محمد کوڕی ابراهیم کوڕی احمد کوڕی ئەبو موسی، ئەبو احمد کوڕی هانیء (الكلبي) ئەثرەم‌و جگە لەوانەش زۆرێکی دیکە لە خزمەت پێشەوا (احمد)دا زانستیان خوێندووە.

## ٦- سەرچاوەکانی شەرعی پێشەوا:-

پێشەوا احمد کوڕی حنبل شەرع (فقه)ی لە سەرچاوە رەسەنەکەی ئایین هەڵگۆزیوەو بۆ ئەم مەبەستە پێنج سەرچاوەی لە شەرع بەکارهێناوە:

١- قورئانی پیرۆز: بە پشت بەستن بەم ئایەتە: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي

الكِتَابِ مِن شَـيْءٍ﴾ (سـورة الانعـام: ٣٨) دلّنيـابن هـيچ شـتێكمان لـه پەرتوك (قورئانی پیرۆز) له بیر نەكردووه)).

٢- سوننەتی پێغەمبەر: بە پشت بەستن بەم ئایەتانـه: ﴿إِن تَنَـازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ﴾ النسـاء: ٥٩، خۆ ئەگەر لـه شـتێكدا بوو بە كێشەتان دەربارەی حوكمی خوایی، ئەوە ئەو كێشەیە بگێڕنەوە بـۆ لای خواو پێغەمبەرەكەی (ﷺ) كە قورئـانو سـوننەت دەگەیـەنێت)) ( تەفسیری ئاسان). هەروەها ئەو ئایەتـەش ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّـهَ إِنَّ اللَّـهَ شَـدِيدُ الْعِقَـابِ﴾ (الحـشر، ٧/) ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پێی بەخـشیون وەری بگـرن، هـەر فـەرمانێكی پێدان بـە گـوێی بكـەن، قەدەغـەی هـەر شـتێكی لێ كـردن مەیكـەن)) تەفسیری ئاسان). بەم جۆرە پێشەوا رێزێكـی زۆر ئـەگرێت لـە سـوننەت. چونكە سوننەت رۆشنكەرەوەی قورئانی پیرۆزەو راڤەی حـوكمو بڕیارەكـان ئەكات. بۆیە هـیچ سـەیر نییـە پێـشەوا (احمـد كـوڕی حنبـل) قورئـانو سوننەت لە پێـشەوەی سەرچـاوە زانـستیەكانی دابنێـت تـاوەكو بڕیـاری شەرعی لێوە هەلێنجێت. بە هیچ جۆرێك جیاوازیو هاودژیەك نابینێت لە نێوان قورئانو سوننەتدا بەڵكو سوننەت بە روونكەرەوەی ماناكانی قورئان تێدەگات، بۆیە ئەبینین پێشەوا احمد وەڵامی ئەوانە ئەداتەوە كـە كـار بـە قورئان ئەكەنو واز لە سوننەت ئـەهێننو لـە وەڵامیانـدا ئـەڵێت: خـوای گـەورە (محمـد) (ﷺ) ی نـاردووە بـە رێنمونیكـارو ئـایینێكی راسـتو دروستی پێسپاردووە تاوەكو ئاشكرای بكاتو بڵاوی بكاتەوەو سەری بخات

بەسەر هەموو بەرنامەو خراپەکاریەك با هاوبەش پەیداکەرەکان (مشرکون)و بێ باوەڕەکانیش پێیان ناخۆش بێت. هەروەها قورئانی پیرۆزی بۆ ناردە خوارەوە تاوەکو ببێتە ڕێنمونیو ڕووناکایی ڕێگەی ژیان بۆ ئەو کەسانەی شوێنی ئەکەونو فەرمانەکانی جێبەجێ ئەکەن. پێغەمبەریشی کردووە بە رابەرو مامۆستاو رێ پیشاندەر بۆ ئایەتەکانی نێو قورئان. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) راڤەکارو دەربڕی قورئانی پیرۆزە.

٣- کۆدەنگی (اجماع)ی زانایانی شەرع زان: کۆدەنگی زانایانی هاو سەردەم، ئەو زانا لێهاتووانەی شەرع کە هاوڕابن، بەلام ئەگەر هاتوو هەندێکیان جیاواز بوون لە بیروڕادا با یەك زاناش بێت ئەوا پێی ناوترێت کۆدەنگی (اجماع)ی زانایان. بەلام ئەگەر هاتوو بیروڕای هەندێك زانا بلاوبووەوەو هەموو زانایانیش بە بیروڕایەکەیان زانیو لێی بێدەنگ بوونو بەرپەرچیان نەدایەوە، ئەوا ئەمەش کۆدەنگییە.

٤- ووتەی یەك لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر ووتەکەی بلاوبۆوەو هاوڕێیە (صحابة)کەش هیچ رەفتارێکی ناپەسەندی لێنەزانرابوو.

٥- پێوانەکردن (قیاس): بریتییە لە بەراوردکردنی شتێك بەهاوێنەکەی لەبەر هەبوونی گونجاویو وێکچوونێك لە نێوان شتە سەرەکی (اصل)و ناسەرەکی (فرع)ەکە. خۆ ئەگەر هیچ پەیوەندیو گونجاوییەك لە نێوانیاندا نەبوو ئەوا پێی ناوترێت پێوانەکردن (قیاس).

بۆیە لە پێوانەکردن پێویستە ڕەچاوی هەبوونی ئەم پەیوەندیو گەنجاوییە بکرێت تاوەکو لە ڕێگەیەوە بەراوردکاریو کاری (وێکچوواندنەکە) ئەنجام بدرێت ئینجا بەهۆی ئەم بەراوردکاری لێکچوواندنە هۆکارێکی گونجاوو دروست بدۆزرێتەوە کە هۆکاری کۆکردنەوە بێت لە نێوان هەردوو شتە سەرەکیو ناسەرەکییەکەدا.

بەم شێوەیە کەوابوو کاری پێوانەکردن (قیاس) لەلای پێشەوا (احمد) وەکو بڕیارێکی ناچاریە لە وێنەی تەیەموم کردنە لەکاتی دەست نەکەوتنی ئاوداو جگە لەوە لەو کارانەی لەکاتی زۆر ناچاریدا شەرع ڕێگەی پێداوە. پێشەوا احمد پرۆسەی بە چاك دانان (استحسان)ی ڕەت کردۆتەوە لە دەرکردنو بڕیار لێدانی لە وەڵامی بابەتو کێشە پەیدا بوەکان. هەروەها بەئاگاییو بەپێگیری (حرص)ێکی زۆرەوە خۆی لە شتە گومان لێکراوەکان ئەپاراستو بە وورديش پابەندی دەقە (نص)ەکان ئەبوو، و لێی لانەئەدا، ئەمەش لەبەر خواپەرستیو تەقوایەکی زۆرەوە بوو، بەشێوەیەك پابەندبوو بە بڕیارەکانی قورئانو سوننەت، ئەگەر هاتوو یەکێك زۆر پابەند بووایە بە قورئانو سوننەت پێیان ئەووت: ((تۆ حەنبەلی)) واتە پێشەوا احمد بوویووە سەر مەشق و نموونەی خواپەرستێکی بێ هاوتا (کە هەرگیز خەم سارد نەبێتو هەمیشەو لە هەمو کاتو شوێنێکدا خوای گەورەی لە بیر بێتو ئایینی ئیسلام بەرنامەو ڕێ ڕوونکەرەوەی ژیانی بێت) زۆر توند بوو لە هیچ فەرمانو بڕیارێکی ئاییندا نەرمی نەئەنواند. ئەمەش ئەو واتایە ناگەیەنێت کە دوور کەوینەوە لە ڕێبازی پێشەوا احمد، نەخێر، بۆ

دوورکەوتنەوە نییە، چونکە لە ڕێبازەکەیدا چەندان بیروڕاو بڕیارو ووتەی جوانو ناوازە هەن کە بەڵگەی شارەزاییو بەئاگایی پێشەوان لە بەرامبەر ئایین.

پێشەوا احمد (ڕەزای خوای لێبێت) چەند مەرجێکی دیارکردبوو بۆ ئەو کەسانەی پۆستی {را- دەرکەر (مفتی)} وەرئەگرێتو ئەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێتەجێ تاوەکو شایەنی ئەو پلەیە بێت، مەرجەکانیش ئەمانەن:

مەرجەکانی {را- دەرکەر (مفتی)} لەلای پێشەوا احمد:

١- نیازو مەبەستێکی دڵسۆزانەو بێگەردانەی هەبێت، خۆ ئەگەر ئەم جۆرە نیازو مەبەستە دڵسۆزانەی نەبوو، ئەوا ڕووناکیو نوری لەلا نییەو قسەکانیشی ناچنە نێو دڵو دەروونەوە تاوەکو پێیەوە پابەندبن.

٢- ئەبێت زاناو نەرمو نیانو لەسەرخۆو دامەزراو، وبەڕێز بێت.

٣- ئەبێت بەهێزو دامەزراوو نەجوڵاو بێت لەوەی بەرەو رووی ئەبێتەوەو ئاگادارو شارەزاش بێت بە بارودۆخەکە.

٤- ئەبێت شایانو گونجاو بێت بۆ ئەو کارەو مەرجەکانی لێهاتوویی تێدا بێتەجێ.

٥- ئەبێت شارەزا بێت بە بارودۆخو ژیانی خەڵك.

٦- ئەبێت تەواو زاناو شارەزاو ئاگادار بێت بە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و زانستەکانی قورئانو فەرموودە.

پێشەوا احمد (رەزای خـوای لێبێـت) خـاوەن شـێوازێکی زانـستیانەی رێكو ووردو ناوازەبوو، نەك بە ئەندێـشەو دوور لـە زانـست بێـت... بـە کورتی پێشەوا احمد خۆی نەپاراست لەوەی لە گێڕانـەوەکان سـەبارەت بـە فەرمووده یان هەر شتێکی دیکەی پەیوەست بە ووتەی هاوڕێیـان یـاخود زانایانی شوێنکەوتووان (تابعین)، زیادی بخاتە سەر یاخود لێی کەم بکات، خاوەن رێبازی تایبەتی خۆی خۆی بوو لە شـەرعدا بـە پـشت بەسـتن بـە سەرچاوە رەسـەنو ساغو بێگەردەکان. بۆیە رێبازو بیروڕاکانی لە شـەرعدا لە زەوی (حجاز)و شـوێنەکانی دیکـەش بلاوبۆتـەوەو موسـڵمانان کـاری پێئەکەن کە تا ئەم سەردەمەی ئێستاش هەر بەردەوامە. ئەمـە بەڵگەیـە لەسەر بەهێزیو دروستی رێبازەکەو ژیاننامەکـەی لەسـەر بەرنامەیـەکی دروستو سەرچاوەیەکی پاكو بێگەرد.

## ٧- دانراوەکانی پێشەوا:-

پێشەوا احمد (رەزای خوای لێبێت) خـۆی یـەکلاکردبۆوە بـۆ زانـستو بایەخو گرنگییەکی بێ وێنەی ئەدا بە فەرموودەکانی پێغەمبـەر (ﷺ). بەرهـەمو پـەرتوکێکی زۆری دانـراوی خـۆی، لـە دوای خـۆی بـۆ ئێمـە جێهێشتووە. بەناوبانگ ترینیان پـەرتوکی ((المسند))ە، کـە کۆمـەڵێکی زۆری فـەرموودەی پێغەمبـەری (ﷺ) تێـدا کۆکردۆتـەوە، لـە سـاڵی (١٨٠)ی کۆچی دەستی کرد بە کۆکردنـەوەی فـەرموودەکان، لەبارەیـەوە ئەڵێن: کردبوویـە بـە پێـشەواو رابـەر، چـونکە ئەگـەر موسـڵمانان هـەر

جیاوازیەکیان لەبارەی هەر شتێکی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) لێ پەیدا ببوایە، ئەوا ئەگەڕانەوە سەری و کۆتا بڕیاریان ئەو پەرتوکە بوو، لەبارەیەوە ئەڵێت: ((کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەرم (ﷺ) لەم پەرتوکەدا کۆکردۆتەوە، بۆیە لە هەموو کاتێکدا بگەڕێنەوە سەری، ئینجا ئەگەر هاتوو بۆ هەر بیروڕایەکم فەرموودەو دۆزییەوە ئەوە باشە، وە ئەگەرنا پشتی پێ مەبەستن و مەیکەن بە بەڵگە چونکە بێ پاڵپشتی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بیروڕاکانم بە بەڵگە ناژمێردرێن)).

هەروەها پەرتوکێکی هەیە بەناوی ((الزهد)) تیایدا باسی خواپەرستی و دونیا نەویستی پێغەمبەرەکان و هاوڕێیان (صحابە)کان و جێنشینە پاك و بێگەردەکان (خلفاء الراشدین) و هەندێك لە زاناو پێشەوا هەڵکەوتووەکان- بە پشت بەستن بە فەرموودەو شوێنەوارو گێڕانەوەی راست و دروست باس کردووە.

هەروەها پەرتوکی (الصلاة) و(المناسك الكبير والمناسك الصغير والتاريخ والناسخ والمنسوخ والمقدم والمؤخر في كتاب الله) و(الفضائل الصحابة)، و(حديث شعبة)، (كتاب الرد على الجمعية والزنادقة) و(كتاب السنة)ی داناوە.

جگە لەمانە چەند پەرتوکێکی دیکەشی داناوەو هەروەها چەندان دەست نووسیشی هەن، کە ئەمانە چاپ و بڵاوکراونەتەوە. دانانی ئەم پەرتوکانەو نووسینیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێشەوا (احمد کوڕی حنبل) (رەزای خوای لێبێت) بە درێژایی ژیانی لە هەوڵ و کۆششدا بووە لە

بڵاوكردنەوەی بانەگەوازو تـاپینی خـوای گـەورە، چ بەدەسـت یـاخود بـە زمانی كۆڵی، نەداوە تاوەكو كۆچی دوایی كـردووەو گەڕاوەتـەوە خزمـەت خوای گەورە.

## ٨- بەڵاو ناخۆشییەكانی پێشەوا:-

پێـشەوا احمـد كـوڕی حنبـل (رەزای خـوای لێبێـت) تووشـی بـەڵاو ناخۆشیو ئەزیەتو ئازاردانو بە قامچی لێـدانێكی زۆرو بەنـدكردنی زۆر بۆتەوە، بەڵام لەبەر هەڵوێستی خۆڕاگرانـەو بـە ئـارام بـوونی لـەو بـەڵاو ناخۆشییەی بەسەری هاتووەو لەگەڵ بەردەوام بوونی بیروڕای خـۆی زیـاتر بەڕێزو بەناوبانگترو خۆشەویستتر بووە لەنێو موسڵمانان.

ئەم بەڵایەش تاقمی (معتزلە) دروستیانكرد كاتێك ووتیـان: قورئـانی پیرۆز دروست كراوە. ئەمەش لە سەردەمی جێنشینی عەباسی (مأمون)دا بوو، كە لەسەر رێبازی (معتزلە)كان بوو، هەروەها زۆریشی خۆشنەویستنو لـە خـۆی نزیـك ئەكردنـەوەو پشتیـشی پـێ بەسـتن لـە هەڵـسوڕاندنی كاروبارەكانی وڵاتدا. بۆیـە (معتزلـە)كـان بـەهۆی ئـەم نزیكییـەیان لـە جێنشینو كاریگەر بـوونی جێنـشین بـە رێبـازی ئـەوان، پلـەو پایەیـەكی بەرزیان هەبوو لەنێو دەسەڵاتی وڵاتدا.

دەرئەكەوێت كە احمد كوڕی ئەبو داودی (معتزلـە)یـی، كـە ئـەوكات وەزیرو راوێژكار بووە لەلای مەئمون ئاگری ئەم بەڵایـەی هـەڵكردبێت بـە سوود وەرگرتن لە دەرفەتو هەلی نەخۆشی مەئمون لە شـاری (طرطـوس)

بۆیــە نووســراوی فــەرمانێکی بــەناوی (مــەئمون)ەوە نووســیو ناردیــە ناوچەکانی وڵات لە پێناو رازیکردنی زانایانو شــارەزایانی شــەرع بــەهۆی ئەم فەرمانەوە لەسەر بیروڕای ((دروست کراویێتی قورئان)).

ئینجا زۆرێــك لــە زانــاو شــارەزایان لــە هێــزو ستەمەکەی ترســانو ملکەچی بڕیارە نارەواکەی بوونەوە، تەنها پێشەوا احمد کوڕی حنبل نەبێت بەرپەرچی دایەوە لەوەی بڵێت: قورئان دروستکراوە، چونکە قورئانی پیرۆز فەرموودەی خوای گەورەیە، وە فــەرموودەش رەفتارێکــە (صــفة)ێکــە لــە رەفتارە (صفة)کانی خوای گەورە. خوای گەورەو پــاكو بێگــەردیش کۆنــە (قدیم)ە نەسەرەتاو نە کۆتایی هەیــە، کــەوابوو رەفتــارو سیفەتەکانیــشی بەهەمان شێوە کۆنو بێ سەرەتان.

دوای ئەوەی پێشەوا احمد کوڕی حنبل پەرچی بڕیارەکەی دایەوەو رازی نەبوو بڵێت: قورئان دروستکراوە، بۆیە بە بەنــدکراویو دەســت بەســتراوی هێنایانە لای جێنشین (مەئمون)[1]، بەڵام لەو کاتەدا مەئمون لەبەر ســەختی نەخۆشییەکەی لە (طرطوس) کۆچی دوایــی کــرد، ئینجــا پێــشەوا (احمــد کوڕی حنبل)یــان بەنــدکرد و چــاوەڕێی ئــەوە بــوون تــاوەکو یــەکێك دوای مەئمون کاروباری وڵات نەگرێتە دەستو نەبێتە جێنشین. پاشان (معتصم) بووە جێنــشینو (کــوڕی ئــەبو داود)یــش هــەر لــە پۆســتەکەی خــۆی لــە وەزیرایەتیدا مایەوە. پاش ئەمانە پێشەوا (احمد)یان هێنایە لای جێنشینو (جێنشین)یش گفتوگۆی لەگــەڵ پێــشەوا احمــد کــرد بــەڵام لەبــەر ئــەوەی (معتصم) لووت بەرزانە هەڵسوکەوتی نەکرد دەســەڵاتدارێتی، کاریگــەری

خراپی لەسەر دڵو دەروونی جێ هێشبوە، وە دووری خستبوەوە لە خوای گەورە، ئەیویست بە زۆر بیروڕاکانی بەسەر پێشەوا (احمد)دا بسەپێنێ، بەڵام پێشەوا (احمد) رازی نەبوو لەوەی بڵێت قورئان دروستکراوە، بۆیە معتصم هەڕەشەی لێکرد، بەڵام پێشەوا سوور بوو لەسەر هەڵوێستەکەی، ئینجا دەستیان کرد بە ئازاردانو لێدانێکی زۆر (بە قامچی) تاوەکو لە هۆش خۆی چوو لە پێناو ئەوەی پەشیمان بێتەوە، چەندان جار دووبارەیان کردەوە، بەڵام پێشەوا هەر لەسەر هەڵوێستەکەی خۆی بەردەوام بوو، دووبارە ناردیانەوە بۆ بەندیخانەو ماوەی دوو ساڵو نیو لەنێو بەیدیخانەدا مایەوە، هەموو ماوەیەکیش جێنشین فەرمانبەری خۆی ئەنارده لای تاوەکو ئامۆژگاری بکاتو پەشیمان بێتەوە، بەڵام پێشەوا هەر رازی نەبوو و بە جێگیریو دامەزراوی لەسەر هەڵوێستە جوامێرانەکەی خۆی مایەوە.

پاش ئەوەی بێ ئومێد بوون لە پێشەوا، لە بەندیخانە ئازادیان کرد لەو کاتەشدا نەخۆشو ماندووبوو بەهۆی ئازاردانەکەشی شوێنەواری برینی زۆری لەسەر لاشەی مابووەوە، بۆیە ماوەیەك لە ماڵەوە پشوویدا تاوەکو خوای گەورە شیفای برینەکانیداو هێزو توانای جارانی بۆ گەڕاندەوە. ئینجا دوای ئەمانە هاتە دەرەوە وەکو جاران بۆ ئەوەی دەست بکاتەوە بەبڵاوکردنەوەی زانستو زانیاری، و فێرکردنی فێرخوازان لە مزگەوتدا.

بەردەوام بوو لە ووتنەوەی وانەکانیدا تاوەکو سەردەمی (واثق) هاتو دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەستو پاش معتصم بوو بە جێنشین، (واثق) لەسەر هەمان رێبازی معتصم رۆیشت بەڵام ئەوە هەیە ئازاری پێشەوا

(احمد)ی نەدا بەڵکو گۆشەگیری کردو لە خەڵك و فێرخوازانی دابڕی و نەیهێشت وانە بڵێتەوەو خەڵك چاوی پێی بکەوێت. پێشەوا احمد بەم گۆشەگیرکردنە مایەوە تاوەکو (واثق)[٣] مردو (متوکل) جێنشینایەتی گرتە دەستو بووە دەسەڵاتدار، شێوازێکی باشتری هەبو لە ئەوانی دیکەی پێش خۆی وەکو واثق و معتصم و هی دیکە لە بەرامبەر پێشەوادا، چونکە فەرمانی گۆشەگیرکردنەکەی پێشەوای هەڵوەشاندەوە، رێگەی پێدا وانە بڵێتەوەو خەڵك سەردانی بکات. ئینجا پێشەوا احمد دەستی کردەوە بە وانە گوتنەوەو بڵاوکردنەوەی زانستەکان، پاشان متوکل هەندێك ماڵی پێشکەش بە پێشەوا کرد، ئەویش رازی نەبوو ماڵەکەی رەتکردەوە، بەڵام جێنشین زۆری لێکرد لەوەی پارەکە وەربگرێت، ئەویش لێی وەرگرت و بەسەر خەڵکیدا دابەشی کرد. دوایی جێنشین بە خەڵکی راگەیاندو ئاگاداری کردن کە پێشەوا احمدی خۆش ئەوێت و رێزی لێ ئەگرێت و رێگا بە کەس نادات دەربارەی پێشەوا احمد بە خراپە باسی بکات و نیازی خراپی بەرامبەر هەبێت یاخود بیەوێت شتێکی لەبارەوە بڵێت. ئینجا جێنشین داوای لە پێشەوا احمد کرد بیروڕای خۆی لەبارەی قورئان- ئایا دروستکراوە یاخود نا- روون بکاتەوە؟

پێشەوا (احمد)یش هەڵوێست و وەڵامی خۆی لە نووسراوێکدا روونکردەوەو بۆ جێنشینی نارد بەم شێوەیە پێشەوا احمد خۆڕاگر بوو لەسەر هەڵوێستە نەگۆڕەکەی و ئارامیشی گرت لە بەندکردن و سزدان و لێدان، هەتاوەکو خوای گەورە ئەم بەڵایەی لەسەر لابرد. بۆیە ناوبانگی

زیاتر لەنێو خەڵکدا بڵاوبوەوە، زۆرێك لە خەڵکی ستایشی هەڵوێستە جوامێرانەکەیان کرد... و تەنانەت هەندێك وتیان: ئەگەر احمد کوڕی حنبل نەبوایە ئەوا هەموو خەڵك ئەبوونە معتزلە.

جارێك وتیانە (بشری حافی) خواپەرست: لەبەرچی نەهاتیە دەرەوەو هەڵوێستێکی وەکو پێشەوا (احمد)ت بنواندبایە؟ ئەویش وتی: ئایا نەتانەوێت شوێنی پێغەمبەران بگرمەوە. بەڕاستی احمد زانایەکی خواپەرست‌و شارەزاو دونیا نەویست‌و خۆڕاگرو بە ئارام بوو لەسەر ئەو ناخۆشییەی بەسەریدا هات‌و پێشەوای ئەهلی سوننەت‌و جەماعەتە. بۆیە ئەو رۆژە پێویست ئەبوو هەڵوێستێکی وەها ئازایانە لە پێناو بڵاوکردنەوەی راستی‌و رێگرتن لە خراپەو ناڕاستیدا لەنێو خەڵکدا بنوێنین.

## ٩- کۆچی دوایی پێشەوا:-

هەموو شتێکی دروستکراو ئەبێت سەرەتاو کۆتایی هەبێت، کۆتایەکەی ئێمەش لەو کاتەوەی خوای گەورە (ئادەم)ی (ﷺ) دروست کردوە، کۆتایەکی زانراوە ئەویش (مردن)ە. ئائەمەیە پێشەوای موسڵمانان کاتی مردن‌و کۆچی دوایی کردنی دێت دوای ژیانێکی پڕ لە تێکۆشان‌و بەجێهێشتنی شوێنەوارێکی باش‌و پاك لەدوای خۆی بۆ ئێمە. (صالح)ی کوڕی پێشەوا باسی کۆچی دوایەکەی پێشەوامان بۆ ئەکات‌و ئەڵێت:

((دوای ئەوەی لەیەکەم رۆژی رەبیعی یەکەمی ساڵی (٢٤١)ی کۆچی (تا)یەکی زۆر توندی هات‌و پلەی گەرمی زۆر بەرز بوەوە، شەویش داهات

هەر بەردەوام بوو، جگە لەوەش هەناسەی زۆر بەنەستەم بۆ نەخورایەوە، منیش نەخۆشیەکەم ئەزانی، چونکە هەموو جار ئەگەر نەخۆش کەوتبایە تەداویم ئەکرد، بۆیە پێم ووت: ئەی باوکە دوێنێ (چ) خواردنێکت خواردوە؟

ووتی: ئاوی پاقلە.

پاشان بەرەبەرە نەخۆشیەکەی زیادی کردو زۆری بۆ هێنا، زۆر بێهێزی کرد، ئینجا (فتح کوڕی سهل)و (کوڕی علی کوڕی جعد) هاتن سەردانی بکەنو گەیشتنە بەر دەرگا، کاتێکیش خەڵك قورس بوونی نەخۆشی پێشەوایان زانی ویستیان بێنە ژوورەوە، دوای ئەوە تەندروستی کەمێك بەرەو باش بوون چوو، ئینجا ڕێگەی دا خەڵکەکە بێنە ژوورەوە، ئێمەش دەرگامان لە خەڵکەکە کردەوە کە پێشتر (مـن)و (فتح)و (کوڕی علی) دەرگامان داخستبوو. ئینجا پۆل پۆل خەڵك ئەهاتنە ژوورەوە بۆ هەواڵ پرسینیو دواتر ئەڕۆیشتنو هی دیکە ئەهاتن، بۆیە خەڵك زۆر بوو بەشێوەیەك بوو کە زۆری خەڵکەکە هەموو کۆڵانەکەی گرتبوەوە.. دەرگای کۆڵانەکەمان داخست.

دوای ئەوەی دوانزە شەو ڕۆیشت لە ڕۆژی هەینی دا کۆچی دوایی کرد)).

کاتێك کۆچی دوایی کرد تەمەنی گەیشتبوە (٧٧) ساڵی. هەموو ئەم تەمەنەی لە خوێندنو فێربوونو بڵاوکردنەوەی زانست لەنێو خەڵکیو فێرکردنی فێرخوازان خەرج کرد. خەڵکێکی زۆری کەم وێنەش ئامادەی ناشتنی تەرمەکەی بوون... خوای گەورە میهرەبانیەکی زۆر بە پێشەوا احمد بکاتو پلەو پایەی لە بەهەشتدا بەرز بکاتەوە، لەوەی تەمەنی خۆی

بەسەر برد لەپێناو بڵاوکردنەوەی زانستەکانی ئایینی ئیسلامو ئێمەش بخاتە سەر ڕێگەی ئەو کەسانەی لەسەر بەرنامەو شێوازی (ئەو) ژیانی خۆیان خەرج ئەکەنو چاو لە ڕەفتارو کردەوەی -ئەو- ئەکەن.

## ١٠- ئەو قسانەی لە دوای کۆچی دواییەکەی- لەبارەیەوە- ووتراون:

### أ- ووتەی ووتاربێژ کوڕی علی کوڕی (المدینی):

خوای گەورە ئەم ئایینەی بەدوو کەس- سێیەمی نیە- بەهێز کرد، ئەویش: ئەبو بەکری ڕاستگۆ لە ڕۆژی هەڵگەڕانەوەداو احمد کوڕی حنبل لە ڕۆژی بەڵاو ناخۆشییەکەی معتزەلەکاندا.

### ب- ووتەی حسین کوڕی محمد کوڕی حاتم:

کەسێکی وەکو (احمد کوڕی حنبل)م نەبینیوە کە هەموو چاکەیەکی تێدا بێتەجێ، سفیان کوڕی عیینەو وەکیعو عبدالرزاقو بقیە کوڕی وەلیدو ضمرە کوڕی ڕەبیعەو زۆرێك لە زانایانی دیکەشم بینیوە، بەڵام کەسیان لە وێنەی احمد کوڕی حنبل نەبوو لە ڕووی زانستو شەرعو خواپەرستیو دنیانەویستەکەی.

### ج- ووتەی پێشەوا شافعی:

لە بەغداد گەنجێکم بینی ئەگەر ووتبای پێیان ڕاگەیاندوینو فەرموودەی باس کردبایە هەموو خەڵك ئەیان ووت: ڕاست دەکەیت،

(مزنی) قوتابیش بە پێشەوا شافعی ووت ئەوە کێ بـوو؟ ئـەویش ووتـی: احمد کوڕی حنبل بوو.

**د- ووتەی احمد سعید (الدارمی):**

هیچ مرۆڤێکی وەکو (ئەبو عبدالله احمد کوڕی حنبل)م نەبینیوە، کـە زیاتری فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) لەبەر بێتو زانـاترو شـارەزاتر بێـت بەواتاو مەبەستەکانی شەرعو فەرموودەدا.

**هـ- ووتەی محمد کوڕی حسین ئەنماطی:**

ئێمە لە دانیشتنێك دابووین کە یحیی کوڕی معینو ئەبو خیثمـە زهـیر کوڕی حربو کۆمەڵێك لە گەورە زانایانی لێبو، هـەموویان باسـی (احمـد کوڕی حنبل)یـان ئـەکردو ستایـشی هەڵوێـستو رەفتـارو کردەوەکانیـان ئەکرد، ئینجا پیاوێکیش ووتی: زۆر- ستایشی بێ سنوری مەکەن، (یحیی کوڕی معین)یش ووتی: ئایا ناپەسەندو خراپە، ستایـشی چـاکەکانی احمـد کوڕی حنبل بکەین؟ خۆ ئەگەر هاتوو دانیشتنی تایبـەتی بـۆ بکـەین بـە مەبەستی ستایش کردنی ئەوا ناتوانین بە تەواوی باسی هەموو چـاکەکانی بکەین.

## ١١- لە ووتەکانی پێشەوا:

١- هەموو شتێکی چاکە کە بایـەخو گرنگـی پێبـدەیتو نیـازی ئـەنجام دانیت هەبێت، ئەوا خێراکە بۆ ئەنجام دانی پێش ئەوەی بەربەستێکت

بۆ دروست بێت- لەنێوان تۆو کردەوەکەداو- توانـات نـەبێ ئـەنجامی بدەیت.

٢- دونیا خانەی کارکردنە، دوارۆژیش خانەی پاداشتە، ئینجا هەرکەسێك لێرەدا ئیش نەکات لە دوارۆژدا پەشیمان ئەبێتەوە.

٣- لەگەڵ براکان بـە دڵخۆشـییەوە- خـواردن بخـۆ-، لەگـەڵ هـەژارانیش بەرێزەوە بخۆ، لەگەڵ دنیاویستەکانیش بە جوامێرانە بخۆ.

٤- پاك‌و بێگەردی بۆ تۆ ئەیخوایە، ئەوانە چەند بێناگان لەوەی لەدوارۆژدا چی چاوەڕێیان ئەکات: یەکێك ئەترسێ-لەوان- بەڵام کەمتەرخەمـەو تکاکاریش- لەوان بێناگایە.

٥- لەلای یەکێکی دنیاویست زانست مەخوێنن.

٦- سەرکەوتوو، ئەو کەسەیە لە دوارۆژدا سەرکەوتوو بێـت‌و مـافی هـیچ کەسیشی نەخواردبێت.

٧- با تەقواو خواپەرستی (توێشوو)ت بێت، دوارۆژیش لەبەر چاوی خۆت دابنێ‌و لەبیری مەکە.

٨- ئەگەر زانا لەبەر خۆپاراستن بێدەنگ بوو، نـەزانیش نەینـەزانی، ئـەی کەوابێ کەی ڕاستی و دادوەریدەرئەکەوێت؟

٩- بنچینەکانی بڕوا سیانن: ڕابەرو نیشاندەر، بەڵگە، ڕێنموونی کراو.

ڕابەرو نیشاندەر: خوای گەورەیە، بەڵگەش: قورئانی پیرۆزە، ڕێنموونی کراویش، بڕوادارە. ئینجا هەر کەسێك ڕەخنە لە پیتێکی قورئـانی پـیرۆز بگرێت، ئەوا ڕەخنەی لە خوای گـەورەو پەرتوکەکـەیی‌و پێغەمبەرەکـەی

(ﷺ) گرتووە.

١٠- جارێکیان احمد کوڕی یحیی هاتە لای، ئەویش بە احمدی ووت:

ئەگەر لە ژیانتدا رۆژێك بە تەنها بووی مەڵێ
بە تەنهام بەڵکو بڵێ هەیە چاودێرێ لەسەر سەرمەوە
گومان مەبە هیچ کاتی خوای گەورە بێ ئاگابێ
یاخود هیچ شتێکی لێ بزربێ
لەبەر بە ئاسان دانانی کردەوەکان
لێمان زۆربوو تاوان لەسەر تاوان
خۆزگە خوای گەورە لە گوناهی رابردوومان خۆشببوایەو
مۆڵەتی تەوبەی دابایین تا تەوبەمان بکردایە
ئەگەر ئەو سەدەیە رۆیی کە تۆ لە ناویاندا ژیاوی
گەیشتی بە سەدەیەکی نوێ، ئەوا نامۆو بێ کەسی

١١- رۆژێکیان علی کوڕی خشرم گوێی لێبوو ئەیووت:

خۆشی تامو چێژی ئەو شتە ئەڕوات کە لە حەرامەوەیەو گوناهو سەرشۆڕیو تاوانیش ئەمێنێتەوە. پاشەڕۆژی خراپ ئەمێنێتەوە هیچ خۆشییەك نییە لە چێژێك کە پاشەڕۆژەکەی سوتان بێت بە ئاگر.

١٢- ئەگەر پیاوێك و بینی حەزی لەقسەکردن بێت ئەوا خۆی لێ بە دوور بگرن.

١٣- خەڵك وەکو نانو ئاو پێویستیان بە زانستە.

١٤- ئەگەر کەسێکتان بینی تۆمەتی خراپە ئەداتە پاڵ یەکێك لە

هاوڕێکانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوا ئێوەش تۆمەتی دەرچوونی لە ئیسلامدا بدەنە پاڵ ئەو کەسە.

## ١٢- پەندو ئامۆژگاری وەرگرتن لە ژیانی پێشەوادا :-

١- ژیان هەمووی کۆشش کردنەو پێویستە کۆششی زۆرمان بۆ فێربوونی زانستو زانیاری بێت.

٢- داوا لە موسڵمان کراوە، هەر لە منالێیەوە تاوەکو مردن بە شوێن فێربوونی زانستو زانیارییەوە بێت.

٣- ئەگەر رۆژێك موسڵمان بە (تەنها بوو)، با بزانێت چاودێرێکی لەسەر هەیە ئەویش خوای گەورەیە.

٤- موسڵمان لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا، داوا لە خوای گەورە ئەکات کە بەڵاو نەهامەتیو پەژارەکانی لەسەر لاببات.

٥- پێویستە زانا تەنها لە خوا بترسێتو بەرەو رووی خراپەکاری ببێتەوەو هەوڵی نەهێشتنی بدات.

٦- زانا نەرمو لاواز نابێت بەرامبەر خۆشیو ناخۆشییەکانی دونیا با هەرچەند گەورەش بن.

٧- موسڵمان دوور ئەکەوێتەوە لە تازە داهێنراوە (بدعە)کانو لێی نزیك ناکەوێتەوە نەوەك تووشی ببێت.

٨- موسڵمان ئاواتو خۆزگە ئەخوازێت خوای گەورە لە تاوانو بێ فەرمانەکانی پێشووی لێی خۆش ببێتو خێراش ئەکات لە پەشیمان

بوونەوەو گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە.
٩- ئەگەر موسڵمان بە مشار بکرێتە دوو پارچە، تاوەکو بێ فەرمانی خوای گەورە بکات ئەوا لە فەرمانەکانی خوای گەورە دەرناچێتو بەرگەی ئەزیەتو ئازاردان ئەگرێت.
١٠- موسڵمان دەست پێشخەری ئەکات لە ئەنجامدانی کاری چاکە پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکاتو بگاتە ڕۆژی دوایی.
١١- موسڵمان بنچینەو شێوازەکانی ئایین لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی پاکی پێغەمبەر (ﷺ) وەرئەگرێت.

## له كۆتاییدا

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای گەورەی پەروەردگاری هەموو جیهانـەکان‌و درودی خوای گەورەش بڕژێت بەسەر پێشەوامان محمد نێردراوی میهرەبانی بۆ هەموو جیهانەکان. هەموو ستایش کردن‌و منـەت کردنێـك بـۆ خـوای گەورەیـە لـەوەی یارمـەتی دایـن‌و تەمـەنی درێـژکردین تـاوەکو ئـەم پەرتوکەمان تەواو کرد، هیـوام وایـە خـوای گـەورە بیکاتـە رووناکـایی‌و رێنمونی بۆ سەر رێگای راستی ئیسلام، بۆ رۆڵەکانی لـە هـەر شـوێنێکی زەوی بێت. هاورێیـەتیان بکات لەنێو تاریکیدا بۆ رووناکی باوەڕو ئیـسلام ، دەرگای زانست‌و زانیارییان بۆ ئاوەڵا بکات‌و دەرگای خراپەشیان لەسـەر دابخات، تاوەکو شوێن ئەو پێشەوایانە بکەون کە هـەر لـەکاتی منداڵیـدا تاوەکو مردن ئاڵای زانست‌و زانیارییان هەڵگرت‌و ژیانی خۆیان بەخـشییە گەلی موسڵمان‌و هەوڵی خۆش بەختی ئەوانیان ئەدا.

له خوای گەورە داواکارم ئەم کارە تەنها لەبەر خاتری ئەو بێت، هـەر ئـەو پـشت‌و پەنامانـەو بـە تواناشـە لەسـەر هـەموو شـتێك. کۆتـا داواکاریشمان ئەوەیە سوپاس‌و ستایش بـۆ خـوای گـەورەی پـەروەردگاری هەموو جیهانەکان.

**عمارە محمد عمارە**

(مصر)

هەینی ١٣/ذی الحجة/١٤٢٣ کۆچی

٢٠٠٣/٢/١٤ زایینی

## سەرچاوەکان:

١- القران الكريم.
٢- الموطأ: للامام مالك.
٣- المسند: للامام احمد، بيت الافكار الدولية.
٤- الائمة الاربعة: الدكتور مصطفى الشكعة، دار الكتاب المصري واللبناني.
٥- ابوحنيفة حياته وعصره: الشيخ محمد ابو زهرة، دار الفكر العربي.
٦- مالك حياته وعصره: الشيخ محمد ابو زهرة، دار الفكر العربي.
٧- الشافعي حياته وعصره: الشيخ محمد ابو زهرة، دار الفكر العربي.
٨- ابن حنبل حياته وعصره: الشيخ محمد ابو زهرة، دار الفكر العربي.
٩- ابو حنيفة النعمان: وهبي سليمان غاوجي، دار القلم دمشق.
١٠- مالك بن انس: عبدالغنى دقر، دار القلم دمشق.
١١- الامام الشافعي: عبدالغنى دقر، دار القلم دمشق.
١٢- احمد بن حنبل: عبدالغنى دقر، دار القلم دمشق.
١٣- الائمة الاربعة: د. احمد الشرباصي، دار الجبل بيروت.
١٤- حياة الائمة: ابراهيم محمد حسن الجمل، دار الفضيلة.
١٥- من مواقف عظماء المسلمين: د. عبدالرزاق الكيلاني، دار النفائس.
١٦- ابو حنيفة بطل الحرية والتسامح: المستشار عبدالحليم الجندي، دار المعارف.
١٧- مالك بن انس امام دار الهجرة: المستشار عبدالحليم الجندي، دار المعارف.
١٨- الشافعي ناصر السنة وواضح الاصول: المستشار عبدالحليم الجندي، دار

المعارف.
١٩- احمد بن حنبل امام اهل السنة: المستشار عبدالحليم الجندي، دار المعارف.
٢٠- من اعلام السلف: احمد فريد، دار الايمان بالاسكندرية.
٢١- اسلام بلا مذاهب: د. مصطفى الشكعة، دار المصرية اللبنانية.
٢٢- صفحات من صبر العلماء: عبدالفتاح ابو غدة، مكتب المطبوعات الاسلامية.
٢٣- الاعلام من الرجال والنساء: عمارة محمد عمارة، دار اليقين بالمنصورة.
٢٤- عظماء الاسلام: محمد سعيد مرسي، دار البشر للثقافة والعلوم.
٢٥- مئة اوائل من الرجال: سليمان سليم البواب، الحكمة.
٢٦- ديوان الشافعي: تحقيق د. مجاهد مصطفى بهجت، دار القلم دمشق.



# ناوەڕۆك




**خوای گەورە بۆ روون کردنەوەی پەیامەکەی خۆی لەو سەردەمانەی کە پێویستی بەروون کردنەوەی هەبووە کەڵەپیاوانی ڕاستگۆو شایستەی هەڵبژاردووە تا زیاتر تیشک بخەنە لەسەر ئەو لایەنەی کە لەلایەن خەڵکی روون نین، بێگومان ئەو کەڵەپیاوانەش ئەو چوار ئیمامەن..**